نیکنات نیسواران

هەژار ئەحمەد هەڵەبجەیی

# ڕێگای عەشق

چیرۆکی گۆڕانی ڕۆحیی

ماهاتما گاندی



چاپی دووەم

# ڕێگای عەشق

## چیرۆکی وەرچەرخانی رۆحیی(ماهاتما گاندی)

**نووسینی:**

**( Eknath Easwaran)**

**وەرگێڕانی:**

**هاوار ئەحمەد هەڵەبجەیی**








**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **ڕێگای عەشق**
- **نووسینی:** Eknath Easwaran
- **وەرگێڕانی بۆ فارسی:** شهرام نقش تبریزی
- **وەرگێڕانی بۆ کوردی:** هاوار ئەحمەد هەڵەبجەیی
- **بابەت:** مێژوو
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **پیتچنین:** هەوار محەمەد – هاوڕێ زادە
- **بەرگ:** ئاسۆ مامزادە
- **ژمارەی سپاردن:** ٤٨٥ ساڵی ٢٠٠٦ دراوەتێ
- **نرخ:** ٢٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠٠٦ – چاپی دووەم ٢٠٠٩
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٣٨٢)**

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

## ناوەرۆك





ئەم كتێبە وەرگێڕدراوی كتـێبی (Gandhi the Man)ە، لـە نووسـینی: ( Eknath Easwaran).

تێبینی:

١– لە پالْ هەندێك پەراوێزدا ئەم چەند پیتە–وە،ك– هاتووە، واتای ئەوەیە كە ئەو پەراوێزە لە لایەن وەرگێڕی كوردییەوە دانراوە.

٢– لە هەر شوێنێك ڕێنووسەكە بە شـێوەیەكی خـوار(*بەلاری*)بـوو، هێمایـە بـۆ دەقی ئاخاوتنی خودی گاندی.

***- پێشکەشە بە ڕۆحی بەرزەفڕی پێنج هەزار شەهیدی شارەکەم (هەڵەبجە) کە، بوونە قوربانی تووندوتیژی.**

***- پێشکەشە بە باوکم، کە لە قۆناغی منداڵیمدا سیمبوڵی هێز و توانا بوو، لەو قۆناغەش بەدواوە بە بوون و نەبوون، پاش(خودا)، تاقە پەناگەم بووە.**

***- پێشکەشە بە دایکم، کە لەیەکەم چرکەی دەسپێکی ژیانمەوە تا دوایین چاولێکنان لەگیتی، سیمبوڵی بەخشندەیی و سەبرە بۆ من.**



**سوپاس بۆ:**

سوپاس بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە لە کاری وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا هاوکارییان کردم، تەنانەت گەر بە یەك وشەش بووبێت.

سوپاس و ڕێزی بێ پایانم بۆ بەڕێزان (هاوڕێ محەمەد زادە) و خاتوو(هەوار محەمەد) کە تا ئەوپەڕی توانا هاوکارییان کردم و کاری هەڵەچن و تایپییان بۆ کردم. هیوادارم هەردەم سەرکەوتوو بن و هیوای سەرفرازییان بۆ دەخوازم و نمونەیان هەر زیادبێت.

سوپاسی تایبەت بۆ:

مامۆستای بەڕێز و خۆشەویستم (ئەکرەم عەنەبی) کە ئەرکی پێداچوونەوەی ئەم کتێبەی بە دڵسۆزییەوە لەئەستۆ گرت. یادی بەخێر.

## پێشەکی وەرگێڕی کوردی

زۆر بیرم لەوە کردەوە کە بۆ پێشەکی ئەم کتێبە چی ئامادە بکەم، بەڵام هەرچی لێکمدایەوە، دێڕێك نەبوو شایانی گەورەیی(گاندی) بێت، بۆیە تەنها دەڵێم:

گەر بڕیار بووایە پاش(موحەمەد)ی پێغەمبەری موسڵمانان، پێغەمبەرێك هەبووایا، ئەوا بەبۆچوونی من، ئەو پێغەمبەرە(گاندی) دەبوو. چونکە ئەو لێبووردەیی و سەبر و عەشقەی کە لە ناخی ئەو مرۆڤەدا هەڵقوڵاوە، خودا تەنها بە خۆشەویست و(پێغەمبەرەکان)ی بەخشیوە.

هیوادارم بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە توانیبێتم بەردێکم خستبێتە سەر بینای کۆمەڵگەی مەدەنی کە ئەمڕۆکە لە کوردستانی ئازیزدا هەوڵی بنیادنانی دەدەین و توانیبێتم بڵێم کە: بە بێ توندوتیژیی لەگەڵ یەك بدوێین و بۆ مافەکانمان تێبکۆشین و دەشتوانین بە ئامانجەکانمان بگەین.

**هاوار ئەحمەد هەڵەبجەیی**

چاپی یەکەم- هەولێر-٢٠٠٦



## وتەیەکی کورت سەبارەت بە چاپی دووەم

خوێنەری بەڕێز، چاپی یەکەمی ئەم کتێبە لە ساڵی ٢٠٠٦ بەناوی(ڕێبازی عیشق)ەوە و لەسەر ئەرکی بەڕێزان لە دەزگای وەرگێڕان، کەوتە بەردەستی خوێنەرانی ئازیز. دیارە هەر کەسێك کە چاپی یەکەمی بینیبێت، جێی خۆیەتی پرسیار بکات کە، ئێستا بۆچی بەناوی(ڕێگای عەشق)ەوە چاپی دووەمی بۆکراوە؟

نازانم تاچەند وەڵامەکەم قەناعەتتان پێ بهێنێت، بەڵام ڕاستگۆیانە دەڵێم کە: دیارە کە ناوی ئەم کتێبە لەزمانی یەکەمیدا(Gandhi the Man)ە و وەرگێڕی فارسی وەك مافی هەر وەرگێڕێك ناوی ئەم کتێبەی کردووە بە: (راه عشق)، کە بەواتای(ڕێگای عەشق)ە. هەر ئەو کات کە ئەم کتێبەم وەرگێڕا، زۆر ئاسایی دەمزانی کە ناوە فارسییەکەی بەواتای ڕێگای عەشقە، بەڵام بە ڕاوێژکردن لەگەڵ چەند مامۆستایەکی زانکۆ و خاوەن ئەزموونتر لەمن لە بواری وەرگێڕاندا، ڕێبازی عیشقم دانا. بەڵام لە پاش پتر لە سێ ساڵ و زۆرترین خوێندنەوەم لە بواری گاندی-ناسیدا، بۆم دەرکەوت کە بەڕێز(شهرام نقش تبریزی)ی وەرگێڕی فارسی، زۆر زیرەکانە بۆ بابەتەکە چووە، بۆیە ناوی کتێبەکی گۆڕیوە. منیش لەپاش ئەو چەندین ساڵ خوێندنەوەیە، بۆم دەرکەوت کە کارەکەی گاندی نەك ڕێباز، کە بەواتای(مکتب) دێت و تایبەت بێت بە چینێکی دیاری کراوی کۆمەڵگای مرۆیی، بەڵکو ڕێگایەکی ئەبەدییە بۆ هەر تاکێك لە هەر گۆشەیەکی ئەم جیهانەدا و تا ژیان بەردەوام بێت پێویستە پیایدا بڕوات؟ گەرنا، هەلومەرجی ژیانی مرۆڤایەتی لەم خوێن ڕیژگەیەی ئەم سەردەمە خراپتر دەبێت، بەتایبەت ئێمەی ڕۆژهەڵاتی و تایبەت تر عێراق و کوردستان. بۆیە ڕێگای عەشقم دانایەوە و هیوادارم کەمێك بوێری

بدەینە بەرخۆمان و نییەتی تێپەڕین یاخود ڕۆیشتن بەم ڕێگایەدا بهێنین، لەپێناو ژینێکی ئەبەدی.

خالێکی تر کە دەمەوێت ئاماژەی بۆ بدەم وەلامی پرسیاری: بۆچی چاپی دووەم؟ ئەوەی کە لەکوردستاندا لەبواری وەرگێڕان و نووسینی کتێب کار بکات، هەر زوو تێدەگات کە ئەو حەقی ماندووبوونەی کە وەریدەگرێت، ناکاتە پاداشتی ماندووبوونی چەند لاپەڕەیەکی ڕۆژنامە یاخود گۆڤارەکان، دواتر و واتە سەرەتاکانی ئەم ساڵ، چەند کتێبخانەیەکی ئەم پیرەشارە داوایان لێکردم کە چاپی بکەمەوە، چونکە گوایا لەبازاڕدا نەماوە. بێ لەوەش چەند برادەرێکی دیکەش هەمان رایان هەبوو. وەك خۆشم پتر لە هەر قۆناغێك هەست بە گرنگی چاندنی تۆوی عەشق و لێبووردەیی لەنێو تاك و خێزانەکان و دامەزراوەکان و ...ی کوردستان دەکرد و دەکەم. بۆیە سەرلەنوێ وشە بەوشە و دێڕ بەدێڕ پتر لەجارێك پێدا چوونەوەم بۆکردەوە. هەروەها چەند برادەرێکی دیکەی زۆر بە ئەزموونتر لەمن، ئەو زەحمەتەیان قەبووڵ کرد و ئەوانیش چەند پێداچوونەوەیەکیان بۆ کردەوە؟ کە جێی خۆیەتی زۆر سوپاسیان بکەم. بەخوێنەری ئازیزیش دەڵێم کە، بەدڵنیاییەوە ئەم چاپە زۆر لە چاپی یەکەم وردتر و پوخت ترە، بەلام ناکاتە ئەوەی کە خیانەتم لە خوێنەری چاپی یەکەم کردبێت و دڵنیاشم هیچکات لەواتا لام نەداوە، تەنها ئەوندەیە پتر پوخت تر و پیشەییانە تر و لەسەر ڕێساکانی زمانی کوردی کاری لەسەر کراوەتەوە.

هیوادارم بۆ ئەم چاپە و کارەکانی دیکەم، ئارەزوو بەدڵی ڕەخنە نەبمەوە.

هاوار ئەحمەد-هەولێر

٢٠٠٩/٨/١٥

## دەروازەیەك بۆ ناسینی نووسەر

ئیکنات ئیسواران[1]ی نووسەر، قۆناغی منداڵی خۆیی لە خێزانێکی دایـك سـالار و کۆندا لە ویلایەتی(کرلای)ی هیندستان بەسەربرد، تازە خوێنـدنی بـە کۆتاهێنـابوو، کە بۆ پەیڕەدن بە نهێنیی زاڵبونی گاندی بەسەر نەفسی خۆیـدا، رۆشـتە دیـداری ئـەو زاتە. پاش چەندین ساڵ و لە خولێکدا کە زۆر بە جدی لە ژێر رێنوێنی و ئیلهامەکانی مامۆستا رۆحییەکەی- داپیرەی- سەرقاڵی پرۆڤەی(مدیتەیـشن) بـوو، وەك وتاربێـژ و مامۆستا، چەند سەرکەوتنێکی پیشەیی وەدەست هێنا، کاتێ کە بۆ بەسـەرکردنەوەی رێکخراوی(فول برایت) چوو بۆ ئەمریکا، وەك بەڕێوەبەری بەشی زمانی ئینگلیـزی لـە یەکێك لە زانکۆ گەورەکانی هیندستاندا خزمەتی دەکرد، لە ساڵی(١٩٦٠) سـەنتەری مدیتەیـشنی(چـیای شـینی) لـە شـاری(برکلـی)ی سـەر بـە ویلایـەتی کالیفۆرنیـای دامەزراند، لەوکاتەوە هەموو هەوڵی خۆی تەرخان کـردووە بـۆ فێرکردنـی مدیتەیـشن بەو کەسانەی کە ژیانێکی خێزانیی و کۆمەڵایەتی چالاکیان هەیە.

ئیـسواران جگەلـە پـەرتوکی(رێگـای عەشـق) چـەند پـەرتوکێکی تـری وەك:(مدیتەیشن، پەرتوکی دەستیی مانترام، بهاگاواد گیتا بۆ ژیانی رۆژانـە، وتووێـژ لەگـەڵ مەرگـدا و ئامـانجی بـەرز)یـشی نووسـیوە. کۆمـەڵێك وتـەی کـورتی عارفـە گەورەکان و کتێبەکانیانی کۆ کردوەتەوە. ئەم پەرتوکـە لـە ژێرنـاوی(خـودا روبارەکـان دەخاتـەڕێ) بڵاوبۆتـەوە، وەرگێڕانـی(کاتائۆپانیـشاد) و(سـێ ئۆپانیـشاد)یـش لـە بەرهەمەکانی ئەوە. ئیسواران لە گۆڤـاری وەرزیـی(چـرای بـچووك)یـش کـە سـەنتەری مدیتەیشن بڵاوی دەکاتەوە هەندێ جار وتار دەنووسێ.

*"مـن کەسـێکی خـەیاڵاوی نـیم، بـەڵکو بانگەشـە دەکـەم کـە ئایدیالیـستێکی کردارگەرام".*

*"بانگەشە دەکەم کە مرۆڤێکی تـەواو ئاسـاییم و توانـستەکانم لـە هـی کەسـێکی ئاسایی-ش کەمترە. بەهیچ شێوەیەك ناتوانم بانگەشەی ئەوە بکەم کە بۆ گەیشتن بـەم پلەیە لە خۆپارێزی و وەهـا رۆحێکـی دامـاڵراو لـە توندوتیـژی، خـاوەنی هـیچ جـۆرە تایبەتمەندییەك بووم. هەموو ئەو هۆکارانەی کە توانییـان مـن بگەیێننـە ئـەم پلەیـە، گەڕان و بەدواداچوونی ماندوونەناسانە بوو. بچووکترین گومانم نییە لەوەی کە هەر ژن و پیاوێ دەتوانێت بگاتە ئەو شوێنەی کە من پێی گەیشتووم، بەومەرجەی کە هەمان ئەو هەوڵانە بەکار بهێنن و هەمان ئارەزوو و باوەڕ لە خۆیاندا پەروەردە بکەن".*

1- Ekhanth Easwaran.



دەروازەیەك بۆ ناسینی نووسەر

# پێشەکی

"پێموایە کە مێژوونووسانی ئایندە نەك وەکو(چەرخی ئەتۆم) بەڵکو وەکو(چەرخی گاندی) دەڕواننە ئەم سەدەی ئێمە. "

ساڵی ١٩٦٦ بۆ یەکەمجار لە کۆڕێکدا لە زانکۆی کالیفۆرنیا لە(برکلی) گوێبیستی ئەم رستەیە بووم، قسەکەر(وتارخوێنەکە) یەك لە مامۆستایانی بانگهێشتکراو بوو بەناوی(ئیکنات ئیسواران). لەوکاتەدا هەرچەندە بەچاوی رێزەوە روانیمە وەها هەستێك، تەنانەت بۆ ساتێکیش بە هزرمدا نەهات کە وشەبەوشەی ئەم رستەیە بەواتای وردی تەعبیر بکەم. بەڵام ئێستاکە دەبینم، دەبێ وەها بکرێت!

ئێستا وادیارە کە هەموو ساڵێك کەسایەتییەکی هەڵکەوتوو هەنگاو دەنێتە پێشەوە، ئاماژە بەو رووناکییە دەدات کە گاندی لە هەموو بوارەکاندا خستوێتیە سەر رێگاکەی- لە ئابوورییەوە بیگرە تا پەروەردەو فێرکردن، لە سیاسییەوە تا فەلسەفە، تەنانەت باس لە رژێمی خۆراك و پاکوخاوێنیش دەکەن.یەکێك لەو روخسارە هەڵکەوتوانەی کە لەم سەردەمەی ئێمەدا ناوبانگێکی جیهانی بەدەست هێناوە(ئی. ئێف. شوماخەر)[2] ە.

2- E.F.Schumacher.





چالاکانی بواری سیاسیش بەچاوی باوکی نەبەردی دوور لەتوندوتیژی دەڕواننە گاندی. بەلای کەمەوە یەك لەم کەسایەتییە چالاکانە دکتۆر(مارتین لۆترکینگ[3])ە کە ناوبراو بە سیمبوڵی چالاکییەکانی خۆیی دادەنێت لە بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاریی بونیادیانە و سەرکەوتوو لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی وڵاتەکەماندا. چاودێرێکی وەك(لۆئی مامفۆرد[4]) لەم نزیکانەدا بەم شێوەیە یادی گاندی دەکاتەوە کە:گرنگترین روخساری "ئایینیی سەردەمی" ئێمەیە. بەڵام لەوانەبێ هیچ کەس هێندەی(گیربای پیج[5]) چاکسازی ماندوونەناسی ئەمریکی کە تا کاتی مردنی لەساڵی(١٩٥٧) تاڕادەیەك لەگەڵ هەمووکەسایەتییە ناودار و بەناوبانگەکانی جیهان کە لە سەدەی بیستەم دا هەنگاویان نابووییە شانۆی مێژووەوە چاوپێکەوتنی سازدابوو، مافی بابەتەکەی لەبارەی گاندییەوە نەدابێت. ناوبراو بەم شێوەیە دەنووسێ و دەڵێ: "کاتێك کە بۆ یەکەمجار هەستی خۆمم لەبارەی گاندییەوە دەنووسی، لەکۆتایی دوایین رستەی نامیلکە بچووکەکەمدا نیشانەی پرسیارێك هەبوو:-ئایا ماهاتماگاندی مەزنترین پیاوی سەردەمی ئێمەیە؟ ئێستا، کە ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو سەردەمەدا تێپەڕ دەبێت ئەو نیشانەی پرسیارە لە هزر و خەیاڵی مندا سڕاوەتەوە. "

سەبارەت بەوەی کە گاندی چۆن وەها مەزنییەکی(عظمت) وەدەست هێنا، هێشتا وەڵامێکی دەستنەکەوتووە و ئەم پرسیارە گرنگترین پرسیارە کە دەبێ بایەخی پێ بدرێ، چونکە هەریەك لەلایەنە جیاوازەکانی مەزنیی ناوبراو تەنیا گۆشەیەك لە رەهەندەکانی کەسایەتی ئەو پیاوەمان نیشان دەدات، ناتوانین هیچ یەك لە رەهەندەکانی کەسایەتی گاندی بە دروستی بناسین تا ئەو کاتەی، سەرەتا وەك مرۆڤ

3- Martin Lutherking.

4- Lewismumford.

5- Kirby page.

نەیناسین، گاندی پێمان دەڵێت:" ژیانی من یەکەیەکی کەرت نەبووە و، هەموو چالاکییەکانی پەیوەستن بە یەکەوە... " سەرکەوتنەکانی گاندی تەنیا لە بوارێکی تایبەتدا کۆتایی پێنایەت، بەڵکو لە ناخی گرفتارییەکی گرنگدایە کە هەموو ژن و پیاو و منداڵێك رووبەڕووی دەبێتەوە، ئەوەش، خودی ژیانە، ئەو چۆن توانی بەو شێوەیە کە ئیسواران دەڵێ:" ژیانی خۆی بگۆڕێ بە وەها بەرهەمێکی تەواو و کامڵی هونەری؟" جاری یەکەم کە دەڕوانییە ژیانی گاندی، بە لاوێکی ناکام کە سەرنجی کەس راناکێشێ دێتە بەرچاومان، لاوێك کە تەنیا تایبەتمەندییەکەی بریتی بوو لە ترسی لە رادەبەدەر لە تاریکی و- هەروەك خۆی لە گێڕانەوەی چێژ وەردەگرێ- گوێچکە گەورە و ناشرینەکانی بوو. چۆن وەها کەسێك توانی ببێتە رابەرێکی پڕ لە وزەی کێشکردن کە تەنانەت نەیارە باوك کوشتەکانیشی نەیانتوانی بەرەنگاری کەسایەتی وی ببنەوە، ئەم لاوە تورە و توندو تیژە چۆن فێر بوو کە گوێ بۆ هەموو جۆرە رەخنەیەکی سوکایەتیپێکەرانە رادێرێ و بە ڕوویەکی خۆش و کراوەوە لە بەرامبەر هەموو نەیارە هەڕەشەکەرەکانیشیدا خۆڕاگربێت و بەجۆرێك هەڵسوکەوت بکات وەك بڵێی هاوڕێیەکی دێرینی خۆیی لەپاش ماوەیەکی دوورودرێژ دۆزیبێتەوە؟ لە یەك وشەدا، ناوبراو چۆن توانی کەسایەتی سووك و بێرێزی-موهانداس. ك- گاندی هەتا ئاستی(ماهاتما)[6] کە گەورەترین هێزە بۆ کامڵبوونی مرۆڤ، بەرزبکاتەوە؟ هێزێك کە ژیاننامەنووسانێکی زۆر پیایاندا هەڵداوە، کەچی کەسیان چۆنیەتی پێکهاتنی ئەو هێزەیان روون نەکردووەتەوە.

ئالێرەدا مەزنیی ئەوکەسەی کە دەیگێڕێتەوە دەردەکەوێت(**ئیکنات ئیسواران**)، ئیسواران کاتێك لە هیندستانی گاندیدا چاوی بە دنیا هەڵهێنا، کە ئەوکات هێشتا هیندستان گوڵی سەرچڵی(ئینگلیز)بوو، یاخود دەیانگوت: درەوشاوەترین دوور لە

٦- بە واتای(رۆحی مەزن)ە لە زمانی هیندیدا.





تاجی ئینگلیزدا-. ئەو گوندە خنجیلانەیەی کە گەشەی تیا کرد، وەك زۆرێك لە گوندەکانی باشووری هیندستان، لە رووداو و تێهەڵچوونە سیاسییەکان" کە پێکهێنەری مێژووی هیندستانن، بەدوور بوو. ئەو هۆکارەی کە کاریگەرییەکی تەواوی هەبوو-و هەیە- لەسەر ژیانی، گاندی نەبوو; بەڵکو ئافرەتێك بوو کە ئیسواران بە مامۆستای رۆحیی خۆیی دادەنێت:- داپیرەی ئافرەتێکی گومناو(نەناسراو) لە مێژوودا بەهێزێکی رۆحیی مەزنەوە- کە هیچ کات لەدەرەوەی گوندەکەی باوباپیرانی نەژیاوە و هیچ کات لە هیچ راپەڕینێکی جەماوەریدا بەشداری نەکردووە. ئەو میراتەی کە لە پاش خۆی بۆ ئیسوارانی بەجێهێشت، زۆر لە راپەڕینە رزگاریخوازانەکەی هیندستان قوڵتر بوو. میراتەکەی ناوبراو، رەوشتی رۆحیی بەپیزی(هندۆئیزم)بوو، بە پێشینەیەکی پتر لە پێنج هەزار ساڵەوە، ئەم ئافرەتە مەزنترین ئامانج و دروشمەکانی ئەو رێبازەی لە ژیانی رۆژانەی خۆیدا بەکار دەهێنا، کە نەبوونی توندوتیژی و عەشق و خزمەتی خۆبەخشانە بەگەل بوو.

ئیسواران هەنگاوی بەرەو کامڵبوون هەڵگرت و ژیان، ناوبراوی بەدوور خستەوە لە سنور(چوارچێوە)ی دنیای فیزیایی رۆحیی داپیرەی. ئیسواران نووسەرێکی رووخۆش و قسەکەرێکی سەرکەوتوو بوو لە ناوەندی هیندستاندا، لە گەرمەی بزووتنەوە رزگاریخوازانەکەی هیندستاندا سەردانی گاندی کرد. لەم سەردانەدا راهێنانەکانی داپیرەی، یارمەتییدا کە لە پشت گاندی سیاسەتمەدارەوە، "گاندی وەك مرۆڤ" ببینێت، چیرۆکی دیداری ئیسواران و گاندی کاریگەرییەکی قوڵی لەسەر من جێهێشتووە. دەتوانم دەشتێکی بەخۆڵ داپۆشراو لەناوەندی هیندستاندا بێنمە بەرچاوم کە ئیسواران لەژێر تیشکی خۆری مۆنی پاش نیوەڕۆیدا، ماوەی چەند-میل-ی وێستگەی شەمەندەفەری"واردا" تا ئاواییەکی بچکۆلە کە چەند خانووە بچکۆلەیەکی لە گڵ دروستکراوی تێدایە بەپێ دەبڕێ، کە گاندی ناوی"سواگرام" یاخود" گوندی خزمەتکردنی" لێنابوو. گاندی هەر لەم گوندەوە میللەتێکی چوارسەد ملیۆنی بۆ

ژیانێکی نوێ بانگهێشت کردەوە، ئیسواران بەبێ ئەوەی کەسێك برەنجێنێت ساتەوەختەکانی پاشنیوەڕۆی بە ئارامییەوە بەچاودێریکردنی دەوروبەری بردەسەر، تەنانەت، لەوکاتەشدا ناوبراو جیاوازی هەبوو لەگەڵ باقی ئەو میوانانەی کە لە کاتی دیداری گاندیدا، لە دەوری کۆ دەبوونەوە. ئەو نەهاتبوو کە لە رەوتی سیاسی گاندی بە ئاگابێت ، یاخود بەدواداچوونی روناکبیرانەی خۆی تێر بکات. نەهاتبوو وەك ئەو کەسایەتییە گرنگانەی کە لە(دهلی)یەوە دەهاتن سەبارەت بە کێشەیەکی گرنگی سیاسی رێنوێنییان بکات، یاخود وەك زۆرێك لە خەڵکانی ئاسایی- کە بە ئەندازەی سیاسەتمەدارەکان دەستیان دەگەیشتە گاندی- هەندێك پرسیاری تایبەتی لێ بکەن، ئیسوارانی لاو، ئافرەت و پیاوانی گەنجی دیتبوو کە وانە و خوێندنگاکانیان بەجێ دەهێشت و پەیوەندییان بە گاندییەوە دەکرد، دیتبووی کە ئەم لاوانە بەچی شێوەیەك باری دەروونییان دەگۆڕێ، کاریگەریی گاندی دەیانکاتە قارەمانگەلێك لە مێژووی هیندستاندا، ئیسواران بەم شێوەیە ئەو ساتانە دەگێڕێتەوە:"من تەنیا دەمویست لە نهێنیی هێزی وی تێبگەم. "

ئیسواران لە مەراسیمی پاڕانەوەی ئەو شەوە لە سواگرام وەلامی خۆی وەچنگ کەوت. گاندی لەگەڵ ئەندامانی(ئیشرام[7])ی خۆیدا لە رێپێوانی خێرا و بەپەلەی پاش ژەمی ئێوارە گەڕایەوە و قوتابییەکانی لە دەوری درەختی(نیم)[8]، کە ناوبراو پاڵی پێوەدەدایەوە کۆ بوونەوە. سکرتێری گاندی، مەهادۆ دیسایی، چەند دێڕێکی لە بهاگاوادگیتا، بەنرخترین پەرتوك لای خەڵکی هیند خوێندەوە:"هەرکەسێ کە بە عەقڵ ژین بەسەر دەبا، خۆی لە هەمووەاندا و هەمووان لە خۆیدا دەبینێت، عەشقی بەرامبەر بە پەروەردگاری عەشق هەموو هیوا و ئارەزوویەکی خۆویستانە- کە

٧- کۆمەڵەیەکی خێزان ئاسا، کە گاندی دایهێنا.

٨- جۆرە درەختێکە کە لە هیندستان دەروێت.





ئەشکەنجەدەری رۆحن- لە دەروونیدا دەسڕێتەوە. " ئەو جەستە بچکۆلەیەی کە خۆر سوتاندبووی لە بەرامبەر چاوانی ئیسواراندا، بێ جوڵە وەستا و بە بیستنی ئەو دێڕانە نوقمی هێزی کێشکردن و دۆخی ئاگایی و نائاگایی بوو. ئیسواران بەم جۆرە ئەو ساتانە دەگێڕێتەوە: "چیدی گوێم لە گیتا نەبوو، بەچاو دەمبینی! ئەو گۆڕانە دەروونییە(استحالە)ی کە گیتا باسی لێوە دەکرد بە چاو دەمبینی. "

هیندستان نیشتمانی جیاوازییە قووڵەکانە، بەلاّم لە یەکگرتووییەکی قووڵدا.

ئەو هێزە رۆحییەی کە ئەو شەوە ئیسواران لە گاندیدا بەدیی کرد، چەندین جار لە نیمچە کیشوەری هیندا بینراوە; گەرچی ژیانی ئەو خەڵکانەی کە بەهۆی ئەم هێزەوە گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە لەگەڵ یەکتر زۆر جیاوازە، بەلاّم هێزەکە هەر نەگۆڕە. دواتر لەپاش ماوەیەك، کاتێك کە ئیسواران راهێنانی مدیتەیشنی بۆ گۆڕانکاری لە ژیانیدا دەستپێکرد، ئەو پێشەنگەی کە لە پێش چاوی بوو و ئەو هەولانەی کە بۆ گەیشتن پێی بەو ئەنجام دەدرا، داپیرەی بوو، بەلاّم گاندی بوو کە بە پەرتوکی کراوەی ژیانی، فێری کرد کە چۆن دەتوانرێ بلندترین ئامانجە مرۆڤایەتییەکان لە ژیانی رۆژانەدا ئاشکراو روون بکرێت. گاندی پیاوێکی گەرۆکی بە ئەزموون بوو، هەمیشە گۆڕانی لە شێوەی ژیانیدا ئەنجام دەدا، تاساتی مەرگ عەیبە و کەموکورییەکانی وردە وردە و پارچە پارچە لەخۆ جیا دەکردەوە. پەرتووکە دەستییەکەی و رێنوێنیکەری هەموو ئەزموونەکانی **بهاگاوادگیتا** بوو، کە خۆی ناوی لێ ناوە"پەرتووکی رۆحی سەرچاوە". ئیسوارانیش ئەم پەرتووکەی وەك پەرتووکی رێبەر و رێنوێنیکەری خۆی هەڵبژارد. لەگەڵ هەموو ئەو جیاوازییە رووکەشانەی کە لەگەڵ یەکتر هەیان بوو، هەردووکیان بۆ رێکخستن و کاملکردنی ژیانیان، پەنایان بردە بەر گیتا. کاتێك کە ئیسواران گۆڕانکارییە رۆحییەکەی گاندیمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئەو شتەی کە لەم کارەدا یارمەتیی دەدا ، ئەزموونی تایبەتی"کەسی" خودی خۆیەتی.

لە وانەکانمدا لە زانکۆی کالیفۆرنیا زۆربەی کات سوود لە فیلمێکی دیکۆمێنتی وەردەگرم لەژێر ناوی"هیندستانی گاندی"، ئەم فیلمە لەسەر بنچینەی چاوپێکەوتنەکانی **بی. سی** لەگەڵ کەسایەتییە جیاوازەکاندا کە گاندییان ناسیوە یاخود لە شۆڕشەکانی ئەودا بەشدارییان کردووە بەرهەم هێنراوە، لەنێو ئەو کەسایەتییانەی کە چاوپێکەوتنیان لەگەڵ سازدراوە، ئافرەتێك بەشدارە بەناوی (ئاشادیڤی[9])، کە لەڕوانگەی من و قوتابییەکانمەوە ئەستێرەی فیلمەکەیە. ناوبراو لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە"گاندی چۆن بوو؟ دیارترین کاریگەریی لەسەر خەڵك چی بوو باسی لێوە بکە! " نهێنی ئەم پیاوە لە دوو وشەدا کورت دەکاتەوە: "عەشقە مەزنەکەی" و لەپاش ساتێکی تر، پەیامنێرەکە بەدەنگێکی گوماناوییەوە پرسیارێك دەخاتە ڕوو کە زۆربەی کات سەبارەت بە پیاوانی مەزنی وەك گاندی دەبیسترێ: "وابیر ناکەیەوە کە ناوبراو کەمێك ناواقیعی بوو و نەیتوانی پەی بە سنووردارییی توانستەکانی ئێمە ببات؟"

باسکردنی ئەو تیشکەی کە دەربڕی عەشق بوو و لە کاتی وەڵامدانەوەدا لە چاوی ئاشادۆیدا درەخشایەوە، بۆ من کارێکی سەختە. ناوبراو گوتی: " توانستەکانی ئێمە هیچ جۆرە سنوورداریییەکی تیا نییە. " ئا ئەمە، هەمان دەنگی گیتایە، بە ڕێگەی یەکەم دەنگی ئینجیل و قورئانە. بەپێچەوانەی ئەوەی کە ئەمڕۆکە لە زۆربەی زاناکانی دەبیسین، گوایە مرۆڤ بەرهەمی جین و شوێنگەی نەشونماکردن نییە. مەزنیی ناوبراو، بەو ئەندازەیەی بیری لێدەکەینەوە بەو شێوەیەی کە ئەفسانەی **چاخی ناوەکی** دەری دەبڕێ، بەهۆی توانایەوە نییە بۆ پێکهێنانی جیهانی دەرەوەی خۆی، بەڵکو مەزنیی ئەو لە توانای بونیاتنانەوە و دروستکردنی خودا خۆی حەشارداوە، هەموومان بۆ گەیشتن بە ئامانجە شکۆدارەکانی نەبوونی توندوتیژی و ڕاستی لەدایك

9- Asha devi.





بووین و گەر ڕۆحمان بەم ئامانجانە ڕوناك بێتەوە ، هیچ یەك لەو لاوازییانەی کە جەستەمان میراتگریەتی ناتوانێ ببێتە بەربەست لە بەرامبەر نەشونماکردنی ئێمە و گەیشتنمان بە پلەکانی کامڵی مرۆڤایەتی، ئەمە شتێکە کە ئاشادیڤ لەگاندییەوە فێربووە و هەمان پەیامێکە کە ئیسواران لە دووتوێی ئەو لاپەڕانەی کە لە بەرچاوی ئێوەی خوێنەردایە هەوڵی دەربڕینیان دەدات. هیوای من وایە کە خوێنەرانی چاپی نوێی "ڕێگای عەشق"، هەر وەك چاپی یەکەم-مەبەست چاپی فارسییەکەیەتی- پاش خوێندنەوەی پەرتووکەکە بڵێن: "بەیارمەتی ئەم پەرتوکە، ژیانی خۆمم گۆڕی. "

**میشڵ. ئێن، ناگلر**[10]

**زانکۆی کالیفۆرنیا- برکلی.**

10- Michael n nagler.

## گۆڕان(*)

هیچ تایبەتمەندییەکی دیار و هەڵکەوتوو جگە لە شەرمن بوونی لە رادەبەدەر لەو کوڕە بچکۆلەیەدا کە ناوی موهانداس کرمچند گاندی بوو، نەدەبینرا. توانا و لێهاتووییەکی تایبەتمەندی نەبوو، قوتابخانەشی بە پلەی خوار مامناوەندی بەکۆتا گەیاند، زۆرزۆر شەرمن بوو، لە ناو کۆڕ و کۆمەڵدا دەست و پێی خۆی ون دەکرد، هۆگریی زۆری بۆ دایك و باوکی، دەبووە هۆی ئەوە کە لە رووداوەکانی دەرەوەی شاری بەندەری و ئارام و بێدەنگیی شوێنی لەدایکبوونی، جگە لە دیمەنێکی لێڵ و تاریك هیچی دی لە هزردا نەبێت. کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە بوو، ئیمپراتۆرییەتی ئینگلیز لەوپەڕی هێز و دەوڵەمەندیدا، پەرەی بە سنووری فەرمانڕەوایی خۆی دەدا. دوو سەدە لە دەسبەسەراگرتنی هیندستان لەلایەن ئینگلیزەوە، تێدەپەڕی.

"*رۆژی دووەمی ئۆکتۆبەری ساڵی* **١٨٦٩** *لە- پوربەندەر کە ناوەکەی تری- سوودامایوری-ە، چاوم بەدنیا هەڵهێناوە، قۆناغی منداڵیم هەر لەم شارەدا بەسەربرد.*

*ئەو رۆژەم لەبیرە کە خرامە قوتابخانە، خشتەی لێکدانم زۆر بە سەختی لەبەرکرد، راستییەك هەیە، ئەویش ئەوەیە کە تەنیا شتێ کە لەو رۆژانە بە یادم ماوە، ئەوەیە*

(*) ئەم وشەیەم لە بەرامبەر وشەی (استحالة) داناوە کە گەر شیکردنەوەی بۆ بکرێت بەواتای: گۆڕان یاخود وەرچەرخان دێت لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر و هەروەها بە واتای گەڕان-یش دێت. و ە، ك.





*کە فێربووم وەك باقی هاوپۆلەکانم، چەندین ناوی جیاواز لە مامۆستاکان بنێم، ئەمە بە دیاری دەخات کە هۆشێکی لاوازم هەبووە".*

" *زۆر شەرمن بووم، لە رووبەڕووبوونەوە و قسەکردن لەگەڵ خەڵك زۆر خۆم دەپاراست. کتێب و بابەتەکانی قوتابخانەم تەنیا برادەرانم بوون. خووی رۆژانەم بریتی بوو لە، لە کاتی خۆیدا ئامادەبوون لە قوتابخانە و هەر لەگەڵ تەواوبوونی کاتی قوتابخانە، راکردن بەرەو ماڵ.*



**گاندی لەتەمەنی حەوت ساڵیدا**

*بەواتای ڕاستی وشە بەرەوماڵ ڕام دەکرد چونکە تاوی قسەکردنم لەگەڵ کەس نەبوو. تەنانەت دەترسام نەبا گاڵتەم پێبکەن."*

*"بێ لەمانەش، ترسنۆك بووم. بەردەوام ترسی دزان تارمایی و مارە زەبەلاحەکان لە دڵمدا بوو. شەوان غیرەتی دەرچوون لە ماڵم نەبوو، زۆر خراپ لە تاریکی دەترسام. تاڕادەیەك بۆم نەدەکرا لە تاریکیدا بخەوم" هەمیشە وام دەزانی تارماییەکان لەلایەکەوە و دزەکان لەلایەك و مارەکان لەلایەکی ترەوە دێن بۆم. کەواتە، ئەگەر چرایەك لە ژوورەکەمدا دانەگیرسابا خەو بە چاوانمدا نەدەهات."*

گاندی لە تەمەنی١٣ساڵیدا، لەکاتێکدا کە هێشتا دەچووە دواناوەندی، ژیانی هاوسەرێتی پێك هێنا. ناوبراو لە پاش ماوەیەك نووسی: تەمەنێکی وەها بۆ پێکهێنانی ژیانی هاوسەرێتی" زۆر کەم و پێکەنین هێنەر"ە. بەڵام-کاستوربای[11]-ی هاوسەری، کچێکی سەرنجڕاکێش بوو و گاندی زووبەزوو فێر بوو کە ڕۆڵی مێردێکی هەوەسباز، ئێرەیی بەر و، بیانووگیر ببینێ. ئەم دوو منداڵە، خواست و کردار و ئاکاری تایبەت بە خۆیان هەبوو، ژیانی هاوسەرییان هەر لە سەرەتاوە گێرمە وکێشەی بەدواوەبوو. گاندی لە هزری منداڵانەی خۆیدا وای دانابوو کە مامۆستای کاستوربای-یە، بەڵام لە پاش چەند ساڵێ بۆی دەرکەوت کە کاستوربای بە لێبووردەیی خۆی، سەرمەشقی ژیانی بووە و پەروەردەی کردووە. لێبووردەیی و هێز و ئاستی تاوگرتنی کاستوربای لەگەڵ ئەو توانای بەخششەی کە هەیبوو، بە درێژایی ساڵانی سەرەتای ژیانیان ڕیشەیەکی قوڵی لە ناخی گاندیدا داکوتا، ئەو ڕیشەیەی کە لە پاش چەندین ساڵ، لە ئەفریقیای باشوور کە دەستی کرد بە بەربەرەکانییەکانی، گەشەی سەند وکەوتە خونچەکردن.

11- Kasturbai.





*"دەبێ بڵێم کە لە ڕادەبەدەر هۆگری بووم. تەنانەت لە قوتابخانەش هەمیشە لە یادی ئەو دابووم. بیری بیستنی دەنگی زەنگی قوتابخانە، ڕۆشتنەوە بۆ ماڵەوە و دیتنی ئەو، هەمیشە دەروونمی داگیر دەکرد.*



**کاستوربای گاندی(هاوسەری گاندی)، لەکاتی یەکەم سەفەری بۆ ئەفریقیای باشوور لە ساڵی١٨٩٦، لەتەمەنی ٢٧ ساڵیدا**

*جودایی شتێك بوو بەرگەی نەدەگیرا. هەموو شەوێ تا درەنگ بە- فرە ڕێسییەکانم نەمدەهێشت بخەوێ.*

*"چۆن دەمتوانی ترسەکانم لای خێزانەکەم کە لە پاڵم دا خەوتووبوو ئاشکرا بکەم؟ چی دی منداڵ نەبووم، بەڵکو لە دەمی لاوێتیدا بووم. دەمزانی کە زاتی(غیرەت) ئەو*

*لە من زیاترە“ لەم رووەوە شەرمم لەخۆم دەکرد، ئەو هیچ ترسی لە مار و تارماییەکان نەبوو، لە تاریکیشدا دەیتوانی بۆ هەر شوێنێك کە بییەوێت بڕوات.* "

گاندی قۆناغی دواناوەندیشی بە پلەی زۆر پرشنگدار بە کۆتا نەگەیاند، بەڵام سەرسەختانە رۆشتە زانکۆ. لە ناخیدا، هەستی بە ئارەزوو و خواستێکی شاراوە دەکرد لەبۆ بوونە پزیشك، ئەو ئارەزووەی کە هیچ کات نەهاتەدی. لە زانکۆ هەمیشە دەکەوت(دەمایەوە). تێگەیشتن لە وانەکانی زانکۆ بۆی ئاستەم بوو، رووی لە هەر لایەك دەکرد لەگەڵ دەوروبەریدا هەستی بە نەگونجانێکی سەخت دەکرد. لە پاش پێنج مانگ لە شکستی یەك لە دوای یەك، دەستی لە خوێندن هەڵگرت و بەبێ بچووکترین بەرنامە بۆ ئاییندە، گەڕایەوە ماڵەوە. بە هیچ شێوەیەك نەیدەزانی دەبێ چی بکات.

سەرئەنجام یەکێ لە مامەکانی فریای کەوت. پێشنیارەکەی مامی بریتی بوو لەوەی کە گاندی بۆ خوێندن لە بەشی ماف، بڕوات بۆ لەندەن. بوون بە پارێزەر تەنیا سێ ساڵ درێژەی دەکێشا، ئەو بڕوانامەیەی کە لە زانکۆکانی ئینگلیز وەدەست دەهات، لە هیندی ژێردەسەڵاتی داگیرکەری ئینگلیز، زامنی سەرکەوتن بوو. دایکی گاندی بەهۆی ئەوەوە کە زۆر هۆگری ئەو منداڵەی بوو زۆر بەسەختی رەزامەندی نیشان دا. ئەرك و تێچوونی ئەم سەفەرە لەوە زیاتر بوو کە بیریان لێکردبوویەوە. لە کۆتایدا کاستوربای ناچار بوو، کە زێڕ و زیوەکانی بۆ پارەی بلیتی سەفەرەکە بفرۆشێ و براگەورەکەی گاندی-یش باقی پارەکەی لە ئەستۆی خۆی گرت.

گاندی پێشتر بۆ ئەو شارانەی کە چەند کیلۆمەترێك لە شوێنی لە دایك بوونییەوە دوور بوون، تەنها بە ئەسپ و گالیسکە سەفەری کردبوو. وەك هەر لاوێکی تەمەن هەژدە ساڵ، پێی وابوو سەفەری دەریایی بۆ بەریتانیا سەفەرێکی پڕ رووداو و جۆش و خرۆشە، بەڵام لەکاتی سەفەرەکەیدا، جگە لە هەستی سەختی تەنیایی هیچی تری بەدی نەکرد. زۆر شەرمن و بێ بڕوا بوو بەرامبەر بە خۆی“ هەمیشە ترسی ئەوەی هەبوو نەبا بەو ئینگلیزییە کتێبییەی (بەشێوەی رێنووسی) کە قسە دەکات، ببێتە





گاڵتەجاڕی خەڵك. کەواتە پەنای بردە بەر تەنیایی و بەدرێژایی ماوەی سەفەرەکەی، لە قەراغی کەشتییەکەوە خۆی بە پیاسەکردن و سەیر کردنی دەریاوە مەشغوڵ کرد. نەدەرۆشتە کافتریا و لە کابین- ژوورەکەی خوێدا، خۆی بەو شیرینی و کولیچانە تێر دەکرد کە دایکی بەر لەسەفەر بۆی دانابوو، دەسێ جلوبەرگی لە قوماشی(فلانل) ئامادە کردبوو و لەگەڵ خۆی هێنابووی، بۆ ئەوەی کاتێ لە کەشتی پیادە دەبێ بیپۆشێ، بەڵام کاتێ کە خۆی لە لەندەندا بەتەنیا کەسێ بینییەوە کە جل وبەرگی سپی لەبەر کردووە، هەستێکی ناخۆش و ئازاردەری لەلا دروست بوو.

چەند مانگی سەرەتای نیشتەجێبوونی لە لەندەن، ترسناك و وەك مۆتەکە وابوو بۆی. جیهانی دەوروبەری لەگەڵ ئەو شتەی کە خووی پێوە گرتبوو جیاوازی هەبوو. وتووویژی و هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەل و مەرجەکەدا گونجاو نەبوو. جوڵە، شێوازی جل وبەرگ پۆشین، چۆنیەتی باری روخسار، واتای بچوکترین جوڵەی سەر و دەست- هەموو ئەمانە- دەبا فێر بێت، فێربوونێ کە بەبێ لێوەشانەوەی هەڵە پێکەنینهێنەرەکان- شتێکی نەکراو و نەگونجاو بوو. نەیدەتوانی دامێنی خۆی لە هەستی دڵتەنگی بەرامبەر بەنیشتیمانەکەی بەردات. هیچکات وەها تەنیا نەبوو بوو.

"*بەردەوام بیرم لە ماڵەوە و نیشتیمان دەکردەوە، دڵم هەمیشە پڕ بوو لە ئەوینی دایکم.*

*شەوان هەردوو روومەتم بە فرمێسك دەشۆرانەوە، بیرەوەرییە جۆراوجۆرەکان خەویان دەڕەواندەوە. نەمدەتوانی خەم و ئازارەکانم لای کەس بدرکێنم. ئەگەریش دەمتوانی، چ سوودێکی هەبوو؟ ئارامبەخشێکم بۆ ئازارەکانم شك نەدەبرد. هەموو شتێ نامۆ بوو. . .*”

گاندی تا چەند هەفتەیەك بیری کڕینی پسولەی کەشتی و گەڕانەوە بۆ نیشتمانی لە هزری خۆیدا تاوتوێ دەکرد، بەڵام غروری، روخسەتی جێبەجیکردنی وەها بیرۆکەیەکی نەدەدا. شتێ لە قولایی دەروونی دا، ناچاری دەکرد، کە خۆڕاگر بێت.

سەرئەنجام، ناسیاوێکی هیندی، کە بە شێوازی ژیان لە لەندەن ئاشنا بوو، دڵی پێی سوتا و بە دەنگێکی تانەو تەشەراوییەوە پێی وت: "تۆ نەهاتووی بۆ ئێرە کە لە کۆلیژی ماف بخوێنیت، هاتووی کە فێرە شێوازی ژیانی(ئینگلیزە)کان بیت" خۆت لەم میوانخانەیەدا حەشار داوە کە چی ببێت؟" گاندی لە مەبەستەکەی تێ گەیشت. پتر لە دوو سەدە بوو کە ئینگلیزەکان فەرمانڕەوایی نیشتیمانەکەیان دەکرد. بەڕای زۆربەی هندییەکان، بێ لە بۆچوونی فیکرییان، ئینگلیزەکان نموونەی مەزنترین دەسکەوتی ژیاری مرۆڤ و سیمبوڵی هێزی فیزیایی-ش بوون. تەنانەت خودی خۆیشی بەهاتنی بۆ بەریتانیا، ناڕاستەوخۆ باڵادەستی ئەوانی قەبوڵ کردبوو. ئیتر بێ چەند و چۆن، ئامۆژگاری برادەرەکەیی قەبوڵکرد و ژوورێکی لای خێزانێکی بەریتانی بەکرێگرت.

گاندی تا ئەوکات هیچ ئەزموونێکی لە لاساییکردنەوەی شێوازی نوێی ژیان نەبوو. لە سەرەتای منداڵییەوە هەرشتێکی دڵخۆشکەر کە سەرنجی رادەکێشا، یەکەمین کاردانەوەی لەبەرامبەری، تاقیکردنەوەی بوو. ئێستاکە ئیتر بڕیاریدابوو ببێتە پیاوێکی خانەدان و جوامێر(جەنتڵمەن)ی بەریتانی، مامۆستایەکی تایبەتی زمانی فەرەنسی و دەستوری قسەکردنی و جل وبەرگی گرانبەهای بەدروین دا و شەپقەی هەوریشمی کڕی. فێرە بەستنی بۆینباخ بوو، فێر بوو کە قژی بەجۆری(شانە فلچەییە بەریتانییەکان)دابهێنێ و لە بەرامبەر ئاوێنەدا بەشانازییەوە سەیری خۆی بکات و تەنانەت بڕێ پارەشی بۆ فێربوونی(ڤیۆلۆن)[١٢] و سەمای(فۆکس تراوس) تەرخانکرد.

بەڵام رۆڵی ئەو پیاوە نموونەییە ئینگلیزە نەیتوانی خواستەکانی بهێنێتەدی. لە بری هێنانەکایەی هەستی ئارامی، پتر لە جاران تووشی هەستی بڕوابەخۆنەبوون بوو و پتر لە جاران بەرامبەر بە بۆچوونی خەڵکی لەمەڕ شێوە وکرداری خۆی هەستیاری

١٢- بەکوردی، بە هەڵە، کەمانچە یان کەمانی پێدەڵێن. و ە، ك.





نیشاندەدا. جگە لەمانەش، ئەم شێوازە ژیانە ئەرك و تێچوونی زۆری دەخواست و لەو روانگەیەشەوە کە براکەی پشتگیریی دارایی ئەوی لە ئەستۆ گرتبوو، وەها دەست بلاوییەك ویژدانی ئازار دەدا. ئەو کەلێنەی کە گاندی لەنێوان خودی دەروونی و خودی دەرەوەیدا هەستی پێ دەکرد رۆژ لە دوای رۆژ بەرینتر و بەرینتر دەبوو.

لە پاش نزیکەی سێ مانگ، لەناکاو خەیاڵە پڕشکۆکان لەبەر چاو ون بوون و نەمان، گاندی لەم خەوە وەخەبەر هات!.

گۆڕینی شێوازی جل وبەرگ پۆشین چۆن دەیتوانی شتێکی زیادە بخاتە سەر کەسێتی راستەقینەی ئەو؟ بۆ گۆڕینی ژیان، دەبا شێوازی بیرکردنەوەی بگۆڕێ! و ئەمە، زۆر قوڵتر بوو لە هێنانەکایەی هەر جۆرە گۆڕانکارییەك لە کولتور و دابونەریتدا. لە بری هەوڵدان بۆ لاساییکردنەوەی هەڵسوکەوتی خەڵك، باشترە کە مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا راستگۆ بێت. پاشتر وەهای نووسی:

"*گەر کەسایەتی من، منی دەکردە(جەنتڵمەن)*[١٣]*، خۆ چ باشتر" گەرنا، باشتر وایە کە دەست لە وەها ئارەزوویەك بشۆم.*"

و بەم جۆرە جارێکی تر، بەسادەیی ژیانی هەڵبژاردەوە.

یەکەم کار کە پێی هەستا، دۆزینەوەی باڵاخانە(شوقە)یەکی سەربەخۆ بوو. پاشان وازی لە هەموو وانە و خولەکانی شێوازی هەڵسوکەوت هێنا. ڤیۆلۆنەکەی فرۆشت و هەست و هۆشی خۆی خستە سەر وانەکانی زانکۆ. کاتێ لەگەڵ قوتابییەکی هەژاری زانکۆ ئاشنایەتی پەیدا کرد کە لە ژورێکدا دەژیا و خۆی چێشتی بۆخۆی لێدەنا، خێرا کردییە پێشەنگی خۆی. ژوورێکی لە سەنتەری شاردا بەکرێ گرت بۆ ئەوەی بۆ هەر جێگەیەك کە بیەوێ بڕوا بەپێ بڕوات؛ بەم جۆرە خۆی لە خەرجیی پاسیش کێشایەوە. هەرچەندە کە سوارنەبوونی پاس، مرۆڤی تارادەیەك سنوردار دەکرد، بەڵام توانی ئەم

١٣- پیاوی خانەدان. وە، ك.

کێشەیە بگۆڕێ بۆ بارێکی وەرزشی. بەپێ ڕۆیشتنە دوور و درێژەکان، تەنانەت لەسەرما سەختەکانی لەندەنیشدا، بە لەش ساغی و بەهێزی دەیهێشتەوە. ئەم بەپێ هاتووچۆکردنانە، لە ناخیدا خوویەکی پێکهێنا کە تا دەمی مەرگ، لەگەڵیدا مایەوە. لە هەمووی گرنگتر، ئەم ئەزموونانە ئەو هەستی باوەڕبەخۆهەبوونەی کە لاساییکردنەوەی خەڵکی لێی سەندبوو، پێی بەخشییەوە، ئەم گۆڕانکارییانە بوونە هۆی ئەوەی کە خۆی بە بەهێزتر و تەنانەت خۆشحاڵتر لە جاران هەست پێ بکات.

دواتر نۆبەی ئەوەهات کە دەست بە تاقیکردنەوەی ڕژێمی خۆراکی بکات.

خێزانی گاندی خۆراکی گیایی-نباتی-یان دەخوارد و هەرچەندە کە گاندی پێشتر بڕوای وابوو کە نهێنیی هێز و توانای ئینگلیزەکان لە گۆشتخواردندایە، بەڵام بەر لە جێهێشتنی ماڵەوە پەیمانی بەدایکی دا کە قەت دەم لە گۆشت نەدا! هاوڕێ ئینگلیزەکان و هاوپۆلە هیندییەکان هەوڵیان دەدا کە رازی بکەن کە گوایا خواردنی گۆشت، بە تایبەت لە ئاو و هەوای ساردی بەریتانیادا، بۆ تەندروستی پێویستە؟ گەرچی بیر و وتە لۆژیك(منطق)ییەکانی ئەوان لەمەڕ ڕاست و دروستی شێوازەکەی، دەیخستە گومانەوە، لەگەڵ ئەمەشدا هەر سوور بوو و پەیمانەکەی خۆی نەشکاند. چەندین مانگ تێپەڕ بوو و نەیتوانی لەسەرتاسەری لەندەندا بە شتێ جگە لە شلەی(سپێناخ) و نان، خۆی تێر بکا. سەرەنجام، گوشاری برسێتی وای لێکرد کە بەشێوەی کردەنی، خۆراکی گیایی تاقی بکاتەوە. لەگەڵ کۆمەڵێ بەریتانی کە زۆر حەزیان لە خۆراکی گیایی دەکرد و هەندێ کتێبیان سەبارەت بە ریژێمی خۆراکی و پاراستنی تەندروستی هەبوو، دۆستایەتی پەیداکرد و هەستا بە خوێندنەوەی کتێبەکان. را و بۆچوونە پێشنیارکراوەکانی ناو کتێبەکە بە تەواوی بەڵگەدار بوون، بەڵام گاندی سوور بوو لەسەر ئەوەی کە خۆی تاقییان بکاتەوە. هەموو جۆرە رژێمە خۆراکییەکانی تاقی کردەوە، بۆ ئەوەی باشترین و بەسوودترینیان بدۆزێتەوە. کەم کەم وازی لە خواردنی خۆراکە زیانبەخشەکان هێنا، هەرچەندە هەندێکیشیان لەگەڵ حەز و





چێژیشیدا دەگونجان. ئێستا ئیتر کە لە(بەهاراتی)[١٤] هیندی بێبەش ببوو، وردە وردە چێژی ڕاستەقینەی خۆراکەکانی دەچەشت و کەم کەم بۆی دەرکەوت چێژ لەو خۆراکانە وەردەگرێ کە جاران لێیان بێزار بوو.

بەم جۆرە، پەیی بەوە برد کە هەستی چەشتن لە زماندا نییە، بەڵکو لە مێشکدایە! لەگەڵ ئەمانەشدا، هێشتا ڕێچکەی خۆیی نەدۆزیبوویەوە. بوون بە پارێزەر، کارێکی یەکجار سەخت نەبوو؛ ئەو شتەی کە دەبا بۆ ئەم مەبەستە ئەنجامی بدات، بریتی بوو لە تاقیکردنەوە زۆر ئاسانەکان و بەشداریکردن لە هەندێ ئێوارەخوانی سەندیکای پارێزەرانی لەندەن. لەگەڵ ئەوەدا کە هیچ پەیوەندییەك لە نێوان وانە و تاقیکردنەوەکاندا نەبوو، گاندی بڕیاریدابوو کە بەباشی لەماف بگات، بەڵام بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەنێوان ئەو شتەی کە دەیخوێند و ئەو شتەی کە دەیزانی، هیچ پاڵنەرێکی نەبوو، بێچارە و دڵسارد، وای دانا کە لە ڕێگای ئەنجومەنی(خۆراکی گیایی) خۆرەکانی لەندەنەوە.

١٤- مەبەست لە(زەردەچەوە و ئاڵەت و...)یە. و ە، ك.



**لەگەڵ ئەندامانی ئەنجومەنی- خۆراکی گیایی خۆران- لە لەندەن، ساڵی ١٨٩٠. نەفەری یەکەم لای ڕاست لەریزی پێشەوە، گاندییە**

حەز و توانای خۆی لە وەدیهێنانی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی تاقی بکاتەوە، بەڵام شەرم و بێدەسەڵاتی هێشتا بەرۆکی بەرنەدابوو. تەنانەت لە کۆڕی دۆستانەی کۆمەڵەکەشدا، توانای دەربڕینی ساناترینی بیروڕاکانی خۆیی نەبوو. هەرکات کۆمەڵێك لە دەوری یەکدی کۆ دەبوونەوە، لەنێوانیاندا خۆی بە بێدەسەڵات و بێهێز هەست پێ دەکرد. گشت کتێبەکانی(ماف)ی بە وردی دەخوێندەوە، بەڵام نیگەرانی و نەبوونی دڵنیایی لەمەڕ توانای خۆی بۆ بەرگریکردن لە بریکاردەرەکەی[١٥] (موکل) هەمیشە بارگرانی دەخستە سەر بیر وهزری.

١٥- ئەو کەسە تاوانبارکراوەی کە دەبا لە دادگادا، بەرگری لێ بکات. وە،ك.





گاندی لە پاش سێ ساڵ نیشتەجێبوون لە لەندەن و سەرکەوتن لە تاقیکردنەوەکاندا، بووە ئەندامی سەندیکای پارێزەران و دادگای باڵا. ڕۆژی دواتر بە کەشتی بەرەو نیشتیمان وەڕێ کەوت. هەواڵی نەخۆشی دایکی زۆر سەغڵەتی کردبوو. پەلەی بەجێهێشتنی لەندەن و گەیشتنە ماڵەوەی بوو. نیگەرانی لەمەڕ بێ توانایی لە پیشەکەیدا هێلانەی لە دەروونیدا کردبوو، تەنیا بە گومان و بۆچوونی خراپەوە دەیتوانی بیر لە ئایندەی خۆی بکاتەوە.

نیگەرانییەکەشی بێ هۆکار نەبوو. لەنێو ڕەشەبا گەرم و دڵتەنگی هێنەرەکانی هێڵی کەمەرەیی زەوی، گەیشتە بەندەری(بۆمبای) پاشتر ناوبراو دەنووسێ کە باوبارانی دەرەوە، لەگەڵ ئەو تۆفانی دوودڵی و گومانە کە لە دڵیدا هەڵی کردبوو، بە تەواوی سازگارییان لەگەڵ یەك هەبوو. براگەورەکەی کە لە شوێنی بارخستندا چاوەڕێی دەکرد، هەواڵی مەرگی دایکی پێدا. ڕادەی پەیوەندی و هۆگریی گاندی بەدایکییەوە، ببووە هۆی ئەوەی کە تا ئەوکاتە هەواڵەکەی لێ بشارنەوە. گاندی خەمەکەی خواردەوە و هەوڵیدا کە هەست و هۆشی خۆی بخاتە سەر پاشە ڕۆژی پیشەکەی، بەڵام هەر لەگەڵ دەسپێکی کار لە(راجکۆت[١٦])، ئەو شارەی کە قۆناغی منداڵی لەوێ بەسەر بردبوو، لەم بوارەشدا رووبەڕووی شکست بوویەوە. جگە لەوەی کە تەنانەت لە نووسینی ئەرز و حاڵێکیش هیچی نەدەزانی کە بەرەو رووی شوێنی تایبەتمەندی بکا، زانیاری و فێربوونەکانی لە کتێبە یاساییەکانی حکومەتی ئینگلیز ببووە هۆی ئەوە کە لە کەمترین زانیاری لەمەڕ یاساکانی هیندستان بێبەش بێت. کەس لە خەیاڵیشدا ڕێگای نەدەدا فایلە یاساییەکەی بچێتە بەردەستی گاندی.

لە بۆمبای-ش بارودۆخ لەمە باشتر نەبوو. هاوکارەکانی بە توانجەوە ناویان نابوو(پارێزەری بێ بریکاردەر). بۆ پڕکردنەوەی کاتەکانی هەموو ڕۆژێ دەچووە دادگای باڵا، بۆ ئەوەی بەڵکو بتوانێ ئەزموونێ وەربگرێ، بەڵام دانیشتنەکان دوور و

16- Rajkot

درێژو وتووێژی قازی و پارێزەرەکان هاوشێوە و بێزارکەر بوو. بەدواداچوونی رەوتی دادگا بۆ گاندی سەخت بوو، زۆربەی کات لە دادگادا خەو دەیبردەوە، یەکەمین و دوایین کێشە کە هاتەلای لە بۆمبای، داوایەکی یاسایی زۆر سادە بوو بە حەقی ماندووبوونێکی(کرێ) دە(١٠) دۆلارییەوە. گاندی بەدەم لەرزەلەرزی ئەژنۆکانییەوە، بۆ ئەنجامدانی کاری لێپرسینەوە لە بەرامبەر ئامادەبواندا راوەستا، بەڵام لەناکاو بۆی دەرکەوت کە تەنانەت توانای دەربڕینی یەك وشەشی نییە، سەرەنجام لەنێو پێکەنینی هاوڕێکانی دا فایلەکەی دایە دەست پارێزەرێکی بەئەزموون و بە پەلە رۆشتە دەرەوە.

لەم ساتەدا، ژیانی گاندی گەیشتبوویە یەکێك لە خاڵەکانی گەڕانەوە، کە بەشێوەیەکی نهێنی ئاسا تاك بەرەو(کەماڵ)پێگەیشتن راپێچ دەکەن و هەندێ کەس ناوی" چارەنووس" یاخود" شانسی" لێدەنێن. گاندی، لە پشت دەیان ساڵ لە پێگەیشتن(تکامل)ی رۆحییەوە، کاتێ یادی ئەو رۆژانە دەکاتەوە، ناوی بەخشیشی ئیلاهی لێدەنێ، بەخشیشێك کە لە شێوەی روودانی چەند رووداوێکدا بۆ دەرخستنی ویست و نیازی نائاگای(لاشعور) و قووڵ، لە دەروونیدا پێی بەخشرا. بێ هیوا و کەساس لە شکست، نائومێد لە دۆزینەوەی فریادرەسێك و پەناگەیەك لە دەرەوەی خۆیدا، ئێستا ئیتر ئامادەی گەڕانەوە بوو بۆ(خود) و دەسپێکی سەفەرە دوورودرێژەکەی بۆ ناسینی(خۆی). شانس یاخود بەخشیشی ئیلاهی ئەوی بۆ وەها کۆششێك بانگهێشت دەکرد.

ئەو رووداوە، لەسەرەتادا هیچی لە شانس نەدەچوو، کۆمپانیایەکی خۆماڵی کە خاوەنەکەی موسڵمانێك بوو، لە رێگای براکەیەوە پێشنیاری بەستنی بۆندێکی یەك ساڵەی پێدا، لەگەڵ نووسینگەکەیان لە(ئەفریقیای باشوور). وەها پیشەیەك متمانە و ناوبانگێکی وەهای نەبوو، لە راستیشدا لە خوار ئاستێکەوە بوو کە شایانی کەسێکی خاوەن بڕوانامەی ئینگلیز بێت. لە هەمانکاتدا پێویست بوو جارێکی دی لە کاستوربای دور بکەوێتەوە کە تازەش کوڕی دووهەمی لەدایك ببوو، بەڵام بێدرەنگ





پێشنیارەکەی قەبوڵ کرد. هەرچۆنێك بێت کارێك بوو کە دەیتوانی هەندێ ئەزموونی تری لێ وەرگرێت، بۆیشی هەبوو کە بۆ هەمیشە دوور بکەوێتەوە لەو بەدبەختیەی کە رووی تێکردبوو.

ئەو هەل ومەرجەی کە گاندی چاوەڕێی دەکرد، زۆر جیاوازی هەبوو لەگەڵ ئەوەی کە لە هزریدا لێکی دابوویەوە. لقی کۆمپانیای(دادا عبدالله) لە هیندستان بە دروستی هەستی بە پێویستی کۆمپانیاکەی نەکردبوو. ئەو فایلەی کە گاندی بۆ بەرگریلێکردنی بۆ ئەفریقای باشوور بانگێشت کرابوو ، فایلێکی زۆر ئاڵۆز بوو کە بۆ بەدواداچوونی، پێویستی بەزاڵبوونێکی تەواو هەبوو لە باری ژمێریارییەوە، بۆ روونکردنەوەی چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەو مامەڵانەی کە بەبێ تۆمارکردن و رێکخستنی بەڵگەی تەواو، بەدرێژایی چەندین ساڵ ئەنجام درابوو. کارەکەی گاندی بریتی بوو لە پێشکەشکردنی راوێژکاری لە کێشە یاساییەکانی کۆمپانیادا، بەڵام زانیارییەکانی ئەو لە بواری بەڕێوەبەرێتیی کارگێڕی، زۆر لە زانیارییەکانی لە بواری مافدا کەمتر بوو. بێ لە هەموو ئەمانەش، گواستنەوە بۆ ئەم وڵاتە، نەك هەر متمانە و رێزی پێ نەبەخشی، بەڵکو بە تەنیا رەنگی پێستی بەس بوو بۆ ئەوەی ببێتە هۆی ئەوە کە بە سووکایەتی و بێ رێزییەوە لەخۆیانی دوور بخەنەوە و تەنانەت بکەوێتە بەر ئازاری جەستەییش. دەتوت گاندی هەموو گرفتەکانی لەنێو جانتاکەیدا لەگەڵ خۆ هێنابوو.

گاندی بەردەوام لە رەوشتی خۆی ورد دەبویەوە. لە رابردووشدا هەرکات لە گرفتێك هەڵهاتبوو، بێ لەو شوێنەی کە پەنای بۆ دەبرد، دووبارە تووشی هەمان گرفت دەبوویەوە، بەڵام بەشێوەیەکی هەڕەشە و گوڕەشاوی تر. ئەم جارەش دەیتوانی بە داخ و کەسەرەوە لەگەڵ ئەو حەقدەستە(کرێ) کەمەی کە کۆمپانیای دادا عەبدوڵڵا دەیدا هەڵبکات و خۆی بەنامەنووسینە بێ واتاکانەوە خەریك بکات و لە پاش دوانزە مانگ، جارێکی تر شکست خواردوو بگەڕێتەوە ماڵەوە، بەڵام بڕیاریدا بەشێوەیەکی

تر هەڵسوکەوت بکات لەگەڵ گرفتەکانیدا. ئێستا کە کۆششی لە بۆ گۆڕینی شوێنگەی دەوروبەری بێ ئاکام بوو، بۆچی هەوڵی گۆڕانکاری لەخۆیدا نەدات؟ بەڵگەیەکی لۆژیکی لە هزریدا نەبوو، بەڵکو لە قوڵایی ناخیدا هەستی پێ دەکرد. بەپەلە دەستبەکاربوو و خۆی خستە نێو ئەو کارەی کە پێی راسپێردرابوو.

زۆری نەبرد کە ئەو سەرڕێژییە(کامڵ بوون) دەروونییەی کە لە لەندەن فێری ببوو و ئاکامەکانی خۆی بەدیارخست، لای خۆیەوە دەستیکرد بەفێربوونی کاری بەڕێوەبەری کارگێڕی و کاتێك بۆی دەرکەوت کە هۆشی تەواوی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە هەیە،متمانە بەخۆهەبوونێکی لەڕادەبەدەری لادروست بوو. خۆشحاڵ لەم سەرکەوتنە، هەموو هۆش و هزری خۆی خستەسەر خاڵی پەیبردن بە وردکارییەکانی فایلەکە و دۆزینەوەی راستی، زانیاری قووڵی لەمەڕ کێشەکە بەدەست هێنا؟ زانیاری وەها کە تەنانەت هەردوو لایەنی داواکە، لێی بێئاگابوون!

بەڵگە وەدەستهاتووەکان، هەموو باسیان لە، لەسەرحەق بوونی بریکاردەرەکەی گاندی دەکرد، بەڵام ئەم داوایە بۆی هەبوو چەندین مانگ درێژە بکێشێ. لە وەها بارێکدا کەس سوودمەند نابێ جگە لە(بریکار) پارێزەرەکان. بەڵام گاندی هیچ حەزی بە سوودوەرگرتن لە مشتومڕە پوچ و داوا یاساییەکان نەدەکرد، بڕیاریدا کارێ بکات کە رووداوەکە بەسوودی هەردوو لایەن کۆتایی پێ بێت. خاوەنەکانی کۆمپانیای دادا عەبدوڵڵا و(لایەنی بەرامبەر) کەس وکاری یەکتر بوون، هەر رۆژێ کە رووداو و رەوتەکە درێژەی دەکێشا، دژایەتی نێوانیان پتر پەرەی دەسەند و دوو پارچەبوونی خێزانیی، نزیکتر دەکردەوە. گاندی بە وتووێژە درێژەکانی، هەردوو لایەنی رازی کرد بەوەی کە ناوبژیوانی قەبوڵ بکەن و لە دەرەوەی دادگادا رێك بکەون. کۆمپانیای داداعەبدوڵڵا دەرەنگتر لەلایەنی بەرامبەر، بەو هەل ومەرجە رازی بوو کە نەدەبووە مایەی شکستی لایەنی دۆڕاو و لە کۆتاییدا هەردوو لایەن هەندێ سوودیان پێ دەگەیشت. گاندی کەوتبوویە سەر زەوق و شەوق. پاشتر دەنووسێت کە:" من لە راستیی پیشەی پارێزەری گەیشتبووم. فێر ببووم کە چۆن دەتوانی





پەی بەلایەنی چاکەی مرۆڤایەتی ببەیت و ڕێ بە دڵ بەری. بۆم دەرکەوت کە ئەرکی سەرەکی پارێزەر نزیك کردنەوە و ئاشتکردنەوەی ئەو دوو لایەنەیە، کە لەیەك جودا بوونەتەوە و لە بەرامبەریەك راوەستاون."

گاندی بێ ئەوەی خۆی بزانێت نهێنیی سەرکەوتنی وەدەست هێنابوو. ئیدی بە چاوی هەلێك بۆ خزمەتکردن دەیڕەوانییە هەر کێشەیەك، بە هەلێ کە دەیتوانی سەرچاوەکانی هۆش و هێزی بیرکردنەوەی خۆی لە ناخیدا پەروەردە بکات و بگەنە دەمی پشکۆتن. بۆی دەرکەوت کە، بە ڕوووەرگێڕان لە خواست و ویستە تایبەتمەندەکانی خود و متمانە و ناوبانگە پیشەییەکان، متمانە و خۆشەویستی سپی پێست و هیندییەکانی ئەفریقای باشووری بۆ خۆی راکێشاوە. رۆژانە ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە خەڵکی ئەم کۆمەڵگایە بۆ فایلە یاساییەکانیان، سەردانیان دەکرد و بۆ یارمەتی وەرگرتن متمانەیان پێ دەکرد. لە ماوەی چەند ساڵێکدا بووە پارێزەرێکی سەرکەوتوو بە دەسکەوتی دەوروبەری بیست و پێنج تاسی هەزار دۆلار لە ساڵێکدا و ببووە خاوەنی ژیانێکی خۆش و بەشکۆی شێوەی رۆژاوایی و گونجاو و شایەن بە پلەکەی.

گاندی کە بە هەل ومەرجەکە رازی ببوو، گەڕایەوە بۆ هیندستان و کاستوربای و دوو منداڵەکەی لەگەڵ خۆی برد بۆ ماڵی نوێی خێزانەکەی لە شوێنی نوێی گوزەراندا، بە سەختی و ماندووبوونێکی زۆرەوە راهاتن لەسەر پۆشینی جل وبەرگی بیانی و ئەنجامدانی رەوشتە لاساییکەرەوەییەکان(تقلیدی). لەسەرەتادا زۆر بە سەختی بەرپەرچی ئەم جۆرە ژیانەیان دایەوە، بەڵام گاندی سەرسەختی و بەرەنگاری نیشاندا. چونکە بە بۆچوونی ئەو(شارستانی) یا رۆژئاواییانە خۆدەرخستن لەنێو خەڵکدا،



**گاندی. ساڵی ١٩٣٦ لەندەن**

زۆرزۆر گرنگ بوو و ئەمە بەهای سەرکەوتن بوو، هەموویان ناچار بوون ئەم بەهایە بدەن. هەڵبەت کاستورباییش بەگشتی نەیدەتوانی لە هەل ومەرجەکە نارازی بێت، مێردەکەی لە تەمەنی٢٧ساڵیدا لە لوتکەی سەرکەوتن و خۆشبەختی دابوو، هەر شتێکیان بویستبا، درەنگ یا زوو دەهاتە بەردەمیان. گاندی گەیشتبووە ئاستێکی ژیان کە تیایدا ئەزموونی زۆربەی لاوان بە کۆتا دێت.

بەڵام گوشاری رامیاری و کۆمەڵایەتی لەسەر هیندییەکانی نیشتەجێی ئەفریقیای باشوور و بەتایبەت هەل ومەرجی قەیراناوی ئەو خەڵکانەی کە وەك کرێکار هاتبوونە ئەوێ و لە بنچینەدا لەسەر سیستەمێکی کۆیلەداری یاسایی خرابوونە بەر کارکردن، کاریگەرییەکی قوڵی لەسەر گاندی بەجێهێشت. یەکێك لەو





کەسانەی کە لەلایەن خاوەن کارەکەیەوە کەوتبووە بەر لێدان و ئازارێکی زۆرەوە، هاتە لای گاندی و داوای یارمەتی لێکرد؟ لە رێگای ئەوەوە لەگەڵ زۆر خەڵکی تر ئاشنا بوو کە بارودۆخێکی هاوشێوەی ئەویان هەبوو. چوو بۆ دیتنی ماڵەکانیان و لە نزیکەوە لەگەڵ خێزانەکانیان و چۆنیەتی گوزەرانیان ئاشنابوو. وردەوردە خۆی لە یادکرد و هەوڵیدا کە کات و سەرچاوەی پێویست بۆ چارەی دەردی ئەم خەڵکە بدۆزێتەوە. ئەمانە خوشك و برای وی بوون. گاندی رۆژ لە دوای رۆژ پتر لەگەڵیان هەستی بە هاودەردی و هاوخەمی دەکرد، ئازارەکانیان ئیدی ئازاری گاندی بوون!

کاتێك کە تاعونی رەش لە(تەنەکە ئاوا)کان، گوندە پیس و پۆخڵەکانی هیندییەکانی نیشتەجێی ژۆهانسبۆرگ، بڵاو بوویەوە، نەخۆش و ئەو خەڵکانەی کە نزیکە مەرگ بوون دەبران بۆ(قەرەنتینە) خانوویەکی چۆڵ. لەم خانووەدا پەرستیاری قارەمانی ئینگلیزی، بەتەنیایی چاودێری دەکردن. لەپاش چەندین ساڵ، پەرەستیارەکە دەیگێڕایەوە کە لەوپەڕی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکەدا، شەوێك جەستەیەکی وردیلانە لەناوەندی دەرگاکەدا بەدیارکەوت، هاوارم کرد:"برۆ دەرەوە، ئێرە تاعونی لێیە." بەڵام پیاوەکە بە هێمنی وەڵامی دایەوە:" باشە، هاتووم یارمەتی تۆ بدەم." پەرستیارەکە، رابەری کۆمەڵگای هیندی ناسییەوە و روخسەتی رۆشتنە ژوورەوەی پێدا. گاندی راستەوخۆ رۆشتە راسەری نەخۆشەکان. پەرستیارەکە کە بینی ئەو دانەویوەتەوە بەسەر پیاوێکدا کە لە دەمی مەرگدابوو و(مێرو) روخساری داپۆشیبوو، گوتی:"وازی لێ بێنە من خووم پێوە گرتووە."




**نووسینگەی کاری پارێزەریی گاندی لە ژۆهانسبۆرگ ساڵی١٩٠٥. لای راستی(سۆنیا شلسین)ە کە یەکێك بوو لە نزیکترین هاوکارەکانی لە ئەفریقیای باشوور**

بەڵام گاندی، خۆی دەستی کرد بە چاودێریکردنی و بەهێواشی و بە هێمنی گوتی:"ئەوە برای منە." و بە درێژایی شەو لەوێ مایەوە هەتا پیاوەکە کەمێك هێور بوویەوە.

*"لە پیشەکەمدا پێشکەوتنێکی بەرچاوم هەبوو، بەڵام ئەم پێشکەوتنە بەهیچ جۆرێ منی رازی نەدەکرد. مەسەلەی هەرچی سادەوساکارترکردنی ژیان و ئەنجامدانی خزمەتێکی هەستپێکراو و بەرچاو بەهاورێکانم، هەمیشە هزرمی ئازار دەدا، هەتا رۆژێك گەڕ(گول)ێك هاتە بەردەرگای ماڵەکەم. دڵم نەهات بە بەخشینی کەمێ*





*خۆراك، بەرێی کەم، رێ و شوێنم پێدا، برینەکانیم تەداوی کرد و دەستم کرد بە چاودێریکردنی...*

*"ئەو ژیانە خۆش و پڕ ئارامییەی کە دەستم پێکردبوو، ئەزموونێکی کاتیی بوو، خانووەکەم، هەرچەند بە جوانی روکەش و رێك خرابوو، نەیدەتوانی خۆی بەسەرمدا زاڵبکات. زۆر لە دەسپێکی ئەم جۆرە گوزەران و ژیانە تێ نەپەڕیببووو، کە دەستم بە کەم کردنەوەی خەرجییەکان کرد، خەرجی جل شۆر زۆر قورس بوو و لەو روانگەشەوە کە خاوەنی جل شۆرەکە هیچکات لە سەری کاتدا جل وبەرگەکانی نەدەهێنایەوە، گەر دەیان کراس و یەخە-م هەبووایا کەم بوو. دەبوایا هەموو رۆژێ یەخەیەك و چ نەبێ رۆژی نا رۆژێ کراسەکەم بگۆڕیبا، ئەم کارە خەرجییەکی زیادە و ناپێویستی بەسەرمدا دەسەپاند، کەواتە شت ومەکی جل وبەرگ شۆردنم ئامادەکرد تا خۆم لەو خەرجییە دوورخەمەوە. کتێبێکم سەبارەت بە شۆردنی جل وبەرگ کڕی و ئەم هونەرە فێربووم و هاوسەرەکەشم فێرکرد. بێ گومان ئەم کارە، گرفتارییەکانمی زیاتر دەکرد، بەڵام تازەبییەکەی دەبووە هۆی ئەوەی چێژی لێوەرگرم.*

*"هیچکات بیرەوەری یەکەم ملیوان کە شۆردم، لەیاد ناکەم. زیاد لە پێویست(ئاهار[١٧])م لێدابوو. ئوتووەکەش بەپێی پێویست گەرم نەبووبوو، لە ترسی ئەوەی نەبا ملیوانەکەم بسوتێ زۆر فشارم نەخستبووە سەر ئوتووەکە. ئەنجامەکەش وەها دەرچوو کە هەرچەندە ملیوانەکە تۆزێ رەق ببوو، بەڵام بەردەوام(سرێش)ی زیادەی لێ دەچۆڕا. بەهەمان ملیوانەوە چووم بۆ دادگا و بوومە گاڵتەجاڕی برادەرە پارێزەرەکانم. کەچی لەو رۆژانەشدا لەبەرامبەر گاڵتە و سووکایەتی پێکردندا، خۆڕاگر بووم و کاریگەری لێنەکراو بووم...*

١٧- گیراوەیەکە لە نیشاستە و کەتیرە دروست دەکرێ و دەدرێت لە یەخە و ملیوانی کراس بۆ رەق بوونی. وە، ك.

*"هەر بەم شێوەیە، دوای رزگاربوون لە کۆیلە بوونی جلشۆرەکە، خۆیشم لە پێویستی سەرتاشیش دەرباز کرد. هەموو ئەو خەڵکانەی کە دەڕۆن بۆ ئینگلیز، هیچ نەبێ فێری هونەری ریش تاشین دەبن، بەڵام تا ئەو جێگایە کە من ئاگادارېم کەس فێری ئەوە نابێت خۆی قژی خۆی چاك بکات. من دەبا ئەویش فێربم. جارێك لە(پۆرۆتۆریا ) چوومە لای سەرتاشێکی ئینگلیز، بەڵام بە سووکایەتی پێکردنەوە جوابی کردم و ئامادە نەبوو کە قژم کورت بکاتەوە. شتێکی ئاساییە کە بێتاقەت بووم، بەڵام خێرا مەکینەیەکی قژچاککردنم کڕی و قژی خۆمم لە بەرامبەر ئاوێنەدا چاك کرد. تاڕادەیەك توانیم پێشەوەی سەرم کورت بکەمەوە، بەڵام پشتی سەرم سەقەت کرد. لە دادگادا پێکەنین ئەمانی لە هاوڕێکانم بڕی بوو.*

*"پرسیاریان لێکردم گاندی قژت بۆ وای لێهاتووە؟ مشك خواردی؟ لە وەڵامدا گوتم: نەخێر، سەرتاشە سپی پێستەکان خۆیان لەوە بەزیاتر دەزانن کە دەست لە قژە رەشەکانی من بدەن، منیش وام بە باش زانی کە چاك یا خراپ خۆم کورتی بکەمەوە."*

بیری خزمەتکردنی فیداکارانە، وازی لە گاندی نەدەهێنا و بەخێرایی چەندین گۆڕانکاری لە گشت لایەنەکانی ژیانیدا بەدیهێنا. ئەو سوودە دارایییەی کە وەك پارێزەرێکی سەرکەوتوو وەدەستی دەهێنا و شێوازی ژیانی رۆژئاوایی(ماڵ و منداڵی) هەموو ئەمانە کاتێك بوونە بەربەست لە رێگای خزمەتکردن بە کۆمەڵگاکەی، واتای خۆیانیان لە دەستدا! هەستان بە هەرکارێ کە بۆ سادەترکردنی شێوەی ژیانی ئەنجامی دەدا،.







**گاندی لە کاتی کارکردنی وەك پارێزەرێك لە ئەفریقیای باشوور، ساڵی ١٩٠٦**

تواناگەلێکی نوێی لە وردبینی و وزە و توانستی لەناوبراودا دەخولقاند. زۆربەی کات لە سەرەتای کارکردنیدا، چاوپۆشیکردن لە کات و خۆشییەکانی بۆ خزمەتکردن بە خەڵکی، تاڵ و زەحمەت دەهاتە پێش چاو، بەڵام ئەو هەستی رزگابوونەی کە لە پاش ئەو کارە هەستی پێدەکرد، گیانبەخش و زەوق و شەوقهێنەر بوو. شادیی گاندی ئاست و سنووری نەدەناسی. بەرەو هەر لایەك کە ڕووی دەنا، ماوەی هەڵبژاردنی دەبینی لەنێوان ژیان بۆ خۆیی و ژیان لەپێناو خەڵکی دی. لەکاتی بەرگرییە پڕ لە

کێشه و سەرئێشەکانی دادگاشدا، کاتێکی بۆ چاودێریکردنی خۆبەخشانه له نەخۆشەکان دەهێشتەوە. دەستی کرد بەبڵاوکردنەوەی گۆڤارێکی هەفتانه لەژێر ناوی(باوەڕی هیندی[18]) و کاتێك له ساڵی١٨٩٩ شەڕ لەنێوان سوپای ئینگلیز و ئاوارەکانی(بوێر) هەڵگیرسا، تیمێکی هیندی له خاچی سووردا بۆ یارمەتیدانی بریندار و لێقەوماوان دروستکرد و دەستی کرد به ئەندام وەرگرتن، ئەو تیمەی خسته نێو ریزەکانی سوپای ئینگلیز بۆ خزمەتکردن. شێوازی کارەکەی ئەو بەناو خەڵکی تریشدا بڵاو بوویەوە. کەم کەم کۆمەڵێکی خێزان ئاسا له ژێرناوی(ئیشرام[19])دا له دەرەوەی شاری(دۆربان) پێکهات و له دەوری گاندی کۆ بوونەوە و ژمارەیەك ژن و پیاوی گەنجی هیندی و رۆژئاوایی که ژیانیان له بۆ ئارەزووە مەزنەکانیان تەرخان کردبوو بۆ ژیان لەگەڵ گاندی و فێربوونی هونەری چۆن ژیان، هاتنه پاڵی. چەندە خودبینی له گاندیدا کەم دەبوویەوە، هێندە دەرۆشته سەر هۆشیاری رۆحیی. دەستیکرد به خوێندنەوەی سەرچاوە ئایینیه جۆراوجۆرەکان، ئەو شتانەی که لێیانەوە فێردەبوو لەگەڵ ئەزموونەکانی خۆیدا بەراووردی دەکردن.

*"بچووکترین نیگەرانی لەمەڕ خۆتان نەخەنه دڵەوە و هەموو شتێ بسپێرن به یەزدان٬ بەڕای من ئەم رستەیە فەرمانێکە که له هەموو ئایینێکدا هەیە.*

*"نابێ کەس لەم بابەتە بترسێ. ئەو کەسەی که به ویژدانێکی ئارامەوە خۆی بۆ خزمەتکردنی خەڵك تەرخان دەکا، رۆژ له دوای رۆژ پتر پێویستیی ئەم خزمەته له دەروونی خۆیدا هەست پێدەکات و بڕوا (ئیمان)ی بێوەستان روو له زیادی دەکات. ئەو کەسەی که ئامادە نییە چاوپۆشی له خواست و ویستە تایبەتییەکانی بکا و له یادی چۆتەوە که، له کاتی له دایکبوونیدا هیچی لەگەڵ خۆی نەهێناوە، به ئاستەم دەتوانێ هەنگاو بنێتە سەر شەقامی خزمەتکردن به گەل. هەریەك له ئێمە به ئاگایی یا به*

18- Indian opinion
19- Ashram





*نائاگایی، بەجۆرێك خزمەتی خەڵکی دەکەین، بەڵام گەر خووگرتن لەسەر ئەم خزمەتکردنە له خۆماندا پەروەردە بکەین، بەشێوەیەکی(ئیرادی) حەزەکانمان بۆ خزمەتکردن، بەهێز و بەهێزتر دەبێ و ئەم خواستە نەك هەر دەبێتە هۆی خۆشحاڵی خۆمان، بەڵکو کەیفخۆشی هەموو گەلانی جیهانیشی بەدواوەیە.*

*"ئەو کەسەی که خۆی بۆ خزمەتکردن تەرخان دەکا، رێگا به بچووکترین بیر و خەیاڵی خۆشگوزەرانیش نادا له هزری دا، بەڵکو دەیسپێرێتە یەزدان و خۆی دەداتە دەست خواستی ئەو. وەها کەسێك به هەرشتێ کە(خوا) بۆی دانابێت رازییە. بەم شێوەیە، خۆی ناکاتە دیلی ئەو شتانەی که لەسەر رێگایدایە، تەنیا ئەو شتەی که پێویستی پێیەتی هەڵی دەگرێ و واز له ئەوی دی دێنێ، ئەو ئارامە و بێبەرییە له توڕەیی و تەنانەت له کاتی سەختی و نشێویدا، لەسەرخۆیی و ئارامی هزر و بیری لێ نافڕێندرێ، خزمەتکردنی ئەو بەگەل هەر وەك چاکە، هیچ پاداشتێکی نییە جگه له ئەنجامی چاکە و پێیشی رازی و خۆشحاڵە.*

*"وەها کەسێك، نه روخسەتی هەیە شتێ له خەڵك وەرگرێ و نه روخستەتیشی هەیە که ئەو شتەی بەڕاستی پێویستی پێی نییە، بیکاتە هی خۆی. خاوەندارێتی شت ومەکی خۆراکی و جل وبەرگ، یاخود کەل وپەلی ناپێویستی ناومال پێشێلکردنی ئەم یاسایەیە. بۆ نموونە گەر دەتوانێ بێ کورسی گوزەران بکات، نابێ بەتەمای هەبوونی کورسی بێت. ئەگەر ئەم یاسا بنەڕەتییە رەچاو بکرێت، تاك بەرەو هەرچی سادەترکردنی ژیان هەنگاو دەنێ. "*

چی دی جل وبەرگی گرانبایی رۆژاوایی لەبەری گاندیدا نەدەبینرا. ژیانی خۆیی له هەر لایەنێکەوە بیگری سادە و ساکار کردبوو. کاستوربای، که پێشتر تەسلیمی خواستی هاوسەرەکەی له مەڕ شێوەی ژیانی رۆژاوایی ببوو و فێر ببوو نانخواردنی به کەوچك و چەتاڵ بێت، ئێستاکە دەبا هەمووی له یاد بکات و بگەڕێتەوە سەر شێوازی پێشووی ژیانی خۆی. گاندی لەسەر بنچینەی بیر و بڕوا پایەدارەکانی سەبارەت به یەکسانی کۆمەڵایەتی و ئەو

گرنگییەی کە بۆ کارەسەختەکانی دادەنا، ناچاری کرد کە خۆی ئاودەست خانەی ماڵەکەی پاك بکاتەوە- ئەو کارەی کە هەمیشە ئەنجامدانی لە ئەستۆی چینە خوارووەکانی کۆمەڵگای هیندیدا بووە- کاستوربای سەرەتا زۆر بەتوندی بەرپەرچی دایەوە، بەڵام بەهۆی ئەو ئەوینەوە کە بەرامبەر گاندی هەیبوو، رازی بوو بە ئەنجامدانی ئەو کارە، لە پاش ماوەیەك گاندی دەڵێ: ناکرێ هاوشانێك لە بەرامبەر لێبوردەیی ئەودا بدۆزرێتەوە.

بەڵام دەمەقاڵێکانی نێو خێزان کۆتایی نەهات، جارێك برێکی زۆر دیاری لەلایەن هیندییەکانی(ناتاڵ)ەوە گەیشتە ماڵی گاندی. مەبەستی هیندییەکان سوپاسکردنی گاندی و هەروەها رێزگرتن و بەرزراگرتنی خزمەتکردنەکانی بوو، بەڵام ئەم کارەیان تەنیا بووە هۆی بەخەبەرمانی گاندی تا بەیانی و پیاسەکردن لە ژوورەکەیدا. ئەو هاوسەر و منداڵەکانی فێرکردبوو کە خزمەتکردنی فیداکارانە، هیچ پاداشتێکی نییە جگە لە خودی خزمەتکردنەکە، ئێستا چۆن دەیتوانی بەو دیارییانە رازی بێت؟ کە لە بەرامبەر خزمەتکارییەکانیدا پێشکەشی کرابوو و ئەمیش هیچ چاوەڕێی پاداشت نەبوو لە بەرامبەریدا. دیارییەکان، گرانبەها بوون و بریتی بوون لە زێڕ و زیو، لەنێو دیارییەکاندا ملوانکەیەکی ئەڵماس پێشکەش بە هاوسەرەکەی کرابوو. نەویستنی و وازهێنان لەو هەموو دیارییە سەخت بوو، بەڵام لەو سەخت تر، قەبوڵکردن و وەرگرتنیان بوو. دەمەو بەیان رەشنووسی نامەیەکی ئامادە کرد کە بەپێی ئەو نامەیە، دەبا دیارییەکان لەپێناو خزمەتکردن بە کۆمەڵگای هیندی بەکاربهێنرێت.

بەڵام چۆن دەتوانێ کاستوربای هان بدات بۆ چاوپۆشیکردن لە زێڕ و زیوەکان؟ کاستوربای سەرسەخت و یەکرا بوو؟ ئەم زێڕ و زیوانە تەنیا پاداشتێ بوو کە لە بەرامبەر ساڵەهای ساڵ هەوڵ و تەقەلادان بۆخۆشی و ئاسوودەیی ژیان و گوزەرانی خەڵك پێی دەگەیی، هەوڵدانێك کە سەختی و ئازارەکانیی ، هاوشان لەگەڵ هاوسەرەکەی و هیچ نەبێ بەقەت ئەو، بەنرخی گیانی کڕیبووی. وتووێژە سەخت و درێژخایەنەکان لەگەڵ گاندی هیچ کاریگەرییەکی نەخستە سەری. سەرئەنجام





کاستوربای دەستی بە گریان کرد و لە تاو ماندوویی و بەناچاری، بەبێ ئەوەی کە بەتەواوی رازی بووبێت، تەسلیمی خواستی گاندی بوو. لەم بارەوە گاندی پاشتر دەنووسێت کە: "قەت لەم کارەم پەشیمان نەبوومەوە، هاوسەرەکەشم بە تێپەڕبوونی چەند ساڵێك، پەیی بەحیکمەتی ئەم کارە بردووە، وەها هەڵوێستێك ئێمەی لە زۆر وەسواسی و دوودڵی پاراست."

**لەگەڵ کاستوربای ساڵی ١٩١٣**

"*مرۆڤ ناتوانێت لە یەکێ لەمەیدانەکانی ژیانیدا بەرێکی و راستگۆیی کاربکات لەکاتێکدا کە لە باقی مەیدانەکانی ژیانیدا ئالوودەی نادروستییەکانە. ژیان، یەکەیەکی لێکدانەبراوە.* "

شەڕە ناوخۆییەکانی ئەفریقای باشوور، هونەری سەختی- ژیان لە بۆ خەڵك و لە یادکردنی خود-ی فێری گاندی کرد. گاندی لە ئاییندەدا ئەم وانەیەی لە

پێوەرێکدا بەکارهێنا بەقەد هەموو جیهان، و بەجۆرێك کە لە کۆتاییدا هەموو خەڵکی جیهان بە ئەندامانی خێزانی ئەو لە قەڵەم دەدران.

لەپاش چەندین ساڵ، ماوەیەکی زۆر پاش جێهێشتنی ئەفریقای باشوور، نامەیەك گەیشتە دەستی گاندی کە تیایدا داوا لە رابەرانی جیهان کرابوو راگەیەندراوێك بۆ مافی مرۆڤ ئامادە بکەن. گاندی لەوەڵامدا دەنووسێت: "ئەزموون بەمن دەڵێت کە راگەیەندراوی ئەرکەکانی مرۆڤ زۆر گرنگترن لە هی مافی مرۆڤ."

لە کاستوربایی هاوسەریەوە فێری وەها بیرکردنەوەیەك ببوو. خودی ئەو لە ژیاننامەکەیدا روونی دەکاتەوە کە لە پاش بەکۆتاهێنانی قۆناغی زانکۆ لە لەندەن و گەڕانەوەی بۆ نیشتمان و، لە کاتێکدا کە بە تەواوی" رۆشنبیر" و ئاگاداری " مافە رەواکان" ی خۆی ببوو، یەکەم کەس کە هەوڵی دا بیخاتە ژێر کاریگەری خۆیەوە، هاوسەرەکەی واتە کاستوربای بوو. بەڵام کاستوربایی گاندیش هەرچۆنێك بێت، ژن بوو و خواستی خۆی هەبوو. گاندی هەر لەگەڵ گەیشتنە ماڵەوەی دەستی کرد بە هێنانەدی ئەو مافانەی کە بۆ خۆی بە رەوا دانابوو، ئاساییە کە کاستوربابییش وەهای کرد، ئەویش دروست لە هەمان کات و هەمان ماڵدا. زۆربەی جار، جیاوازییەکانیان دەبووە هۆی گریانی کاستوربای کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا، پتر گاندی توڕە و پەشۆکاوتر دەکرد. جارێك لەکاتی هەڵچوون و توورەبوونێکی زۆردا، نەڕاندی بەسەر هاوسەرەکەیدا: "من بەرگەی وەها بوونەوەرێکی قۆڕ و دەبەنگ ناگرم لەماڵەکەم دا.

کاستوربای لە وەڵامدا وتی: "کەواتە ماڵی خۆت بۆ خۆت و بهێڵە با من بڕۆم. گاندی کە لەتاو توڕەیی بڵێسەی سەندبوو، دەستی کاستوربایی کە فرمێسکی هەڵدەڕشت گرت و رایکێشا بەدوای خۆیدا و بەرەو دەرگاکەی برد.

کاستوربای بەدەم گریانەوە هاواری کرد: "تۆ ئەزانی تەریقبوونەوە چییە؟ بۆ کوێ بڕۆم ؟ خۆ من لێرە کەسێکم نییە بچم بۆ لای. وا دەزانی لەبەر ئەوەی ژنی تۆم دەبێ





لەگەڵ هەموو بەدرەوشتییەکانت هەڵکەم و بگونجێم؟ توخوا وەرەوە سەر خۆت و دەرگاکە داخە. مەهێڵە بەم جۆرە و لەم حاڵەدا بمان بینن. ."

گاندی خۆی دەگێڕێتەوە کە تا ئەو کات وای دەزانی وەك مێردێك مافی ئەوەی هەیە کە بیروڕاکانی بەسەر کاستوربابییدا بسەپێنێ. بەڵام بەتێپەڕبوونی چەندین ساڵ و درێژەکێشانی ئەم گێرمەو کێشانە، کەم کەم بۆی دەرکەوت کە بە تێڕوانینە وشك و کۆنەخوازانەکانی خۆی چ ناڕەحەتییەکی بۆ هاوسەرەکەی دروست کردووە. سەرئەنجام بەهزریدا هات لە بری سەپاندنی" مافەکانی" خۆی، دەبێ ئەرکەکانی خۆی بە ئەنجام بگەیەنێت، بۆ گاندی زانین، هەمان هەستکردنە، هەستکردنیش، هەمان کارپێکردن و کارپێکردنیش خودی ژیان بوو. کەواتە بێ دواکەوتن لە بری ناچارکردنی کاستوربای بەلاساییکردنەوەی بیروڕا و ئەو بەهایانەی کە تازە وەدەستی هێنابوو, هەوڵیدا خۆی بکاتە سیمبولێك بۆ ئەوەی بتوانێت ئەویش رێنوێنی بکات بەرەو ئەو رێگایەی کە خۆی گرتبوویە بەر. کارێکی ماندووکەر و درێژماوە بوو و زۆرجار، پێویستی بەوە هەبوو کە گاندی چاوپۆشی لە حەز و خواستەکانی خۆی بکات و لە بری تێڕوانین لە دیدگای خۆیەوە، لە دیدی کاستوربایەوە بنوارێتە جیهان. گاندی وردە وردە بۆی دەرکەوت کە گێرمە و کێشەیەك لە ئارادا نییە، جگە لەوەی کە ئەو سەپاندوویەتی بەسەر کاستوربابییدا، تێگەیشت کە هەوڵی کاستوربای هەمیشە ئەوەبووە کە بە بەخشینی ئەوین بیخاتە سەر رێ، ئەمە یەکێك بوو لە دۆزینەوە بنچینەییەکانی گاندی لە ژیانی سەرتاپا ئەزموون و تاقیکردنەوەیدا کە پێی گەیشت: "بۆ هێنانەکایەی گۆڕانکاری لە خەڵکدا، سەرەتا دەبێت گۆڕانکاری لە خود-دا ئەنجام بدەیت".

ئەزموونەکانی گاندی بەرەبەرە ئەویان بەرەو جیهانێك دەبرد لە بونیاد و قوڵایی چینە دیار و رواڵەتییەکانی ژیاندا، کە کەم کەس رێیی پێ بردووە، ئەو جیهانەی کە

تیایدا بەها پوچەکانی بازرگانی، ناوبانگ، چێژ، هیچ واتایەکیان نییە. نووسەران و فەیلەسوفگەلێکی زۆر بەر لە گاندی چەندین کتێبی (قەبە)[٢٠]یان لەبارەی راستی و خۆشبەختییەوە نووسیوە، بەڵام جگە لە چەند کەسێکیان کە بە پەنجەکانی دەست دەژمێردرێن، توانای گۆڕینی ژیانی خۆیانیان نەبووە. گاندی حەزی بەو یاسا و بنچینە هزرییانە نەبوو. ئەو دەیویست فێری هونەری ژیان بێت، ئارەزوومەند بوو کە بەشێوەی پێویست کەسایەتی خۆی بە تەواوی بگۆڕێ بەڵکو خۆی لەو مەبەستە نزیکتر بکاتەوە. لە کاتی گەڕان بەدوای رێنیشاندەرێکدا، ژیان و بەرهەمی چەندین کەسایەتیی بە وردی خوێندەوە کە لە نەتەوە و ئایینە جۆراوجۆرەکان بوون. ئەو رێنیشاندەرەی کە سەرەنجام دۆزییەوە، شێوەی رەوشتی رۆحانی تایبەت بە ولاتەکەی خۆی بوو، ئەو شێوازەی کە پتر لە پێنج هەزار ساڵ بێ وەستان لەنێوخەڵکی ولاتەکەیدا باو بوو.

لە قۆناغی منداڵیدا بەردەوام بهاگاوادگیتا لە پاڵیدا بوو. لەگەڵ ئەمەشدا هەتا نەچووبوو بۆ بەریتانیا، هیچ کات هەستی بە توانای بهاگاوادگیتا نەکرد بۆ هاوتەریب بوونی لەگەڵ ژیانی راستەقینەدا. لە لەندەن لەگەڵ برادەرە بەریتانییەکانی دەستی کرد بە خوێندنەوەی وەرگێڕدراوەکانی(گیتا)، پاشتر باسی دەکات کە کاتێ بۆ یەکەمجار گیتای خوێندەوە، وشەکانی راستەوخۆ چوونە دڵییەوە بۆ ئەوەی دواتریش لە ئەفریقای باشوور کەم کەم کاریگەری بخەنە سەر کرداریشی. لەوێدا بوو کە گیتا لە روانگەی ئەوەوە، بوو بەوەی کە ناوی لێنا"کتێبی رۆحیی سەرچاوە" [٢١]؟ ئەو کتێبەی کە رێنوێنیکەری پراکتیکی ئەو بوو لەو مەترسی و نشێوانەی کە بە پتر قوڵبوونەوە لە لێکۆڵینەوەکانیدا بۆ راستی، رووبەروویان دەبوویەوە.

٢٠- قەبە لە رووی زۆریی پەڕەکانییەوە.وە،ك

21- Spiritual Reference Book.





*"سەبارەت بەوەی کە خوێندنەوەی گیتا چ کاریگەرییەکی هەبوو لەسەر هەڤاڵەکانم، تەنیا خودی خۆیان ئاگادارن; بۆ من، گیتا بووە سەرمەشقێکی دڵنیا بۆ هەڵسوکەوتم. ئیدی ببووە کتێبی سەرچاوەی رۆژانەم. رێك بەو جۆرەی لە ئەگەری نەزانینی واتای وشەیەکی ئینگلیزی پەنام دەبردە بەر فەرهەنگی ئینگلیزی; لە پێناو دۆزینەوەی خێرای رێگاچارە بۆ هەموو گرفتەکان و نیگەرانییەکانم دەگەڕامەوە و پەنام دەبردە بەر ئەم فەرهەنگی ئاکارە. هەندێ وشەی وەك ئاپاریگراها (نەبوونی خاوەندارێتی) و سامابهاوا(هێمنی، ئارامی) سەرنجمیان بۆ خۆیان رادەکێشا. بەڵام کێشە لەوەدابوو کە چۆن بتوانی ئەم هێمنییە لەخۆدا پەروەردە بکەیت و بیپارێزیت؟ چۆن دەکرێ لەگەڵ کاربەدەستانی گەندەڵی بێ شەرم و هەروەها دۆستانی دوێنێ کە ئەمرۆ بێ بنەما ئاڵای دژایەتییان بەرزکردۆتەوە، رێك وەك ئەو کەسانە هەڵسوکەوت بکەیت کە هەمیشە چاکەخوازی مرۆڤ بوونە؟ چۆن دەتوانی واز لە هەموو ئەوشتانە بهێنی کە هی خۆتە؟... ئایا دەبێ چاوپۆشی لە هەموو ئەو شتانەی کە هەمە بکەم و بکەومە دووی(ئەو)؟ وەڵام، بێ درەنگ گەیشت: ناتوانم بکەومە دووی(ئەو) مەگەر چاوپۆشی بکەم لە هەرچییەك کە هەمە.*

*"خوێندنەوەکانم لە یاسا بەریتانییەکاندا وەفریام هاتن. زانیم کە تەعالیمی نەبوونی خاوەندارێتیی گیتا بەم واتایەیە کە، ئەوانەی مەیلی رزگارییان لە خەیاڵدایە دەبێ وەك باوەڕپێکراوێکی ئەمین هەڵسوکەوت بکەن. ئەو باوەڕپێکراوەی کە چەندە زاڵ بێت بەسەر ماڵ و دارایی زۆردا، زەرەیەکی بەهی خۆی نازانێ."*

گیتا بۆ پەڕینەوە لە دەریای ژیان، رێسایەکی کاریی وردبینانەی هەیە. ئەو مەیدانی نەبەردەی کە شوێنی رووداوی چیرۆکی گیتایە، هێمایەکە لە دڵی مرۆڤ کە تیایدا هێزی روناکی و ئەوین لەگەڵ تاریکی و نەفرەت لە سەر زاڵبوون بەسەر هزر و کرداردا لە جەنگێکی هەمیشەیی و بێ وەستاندان. (ئارجۆنا) شازادەیەکی جەنگاوەر،

هێمای هەموو مرۆڤایەتییە، دەیەوێت هونەری ژیان لە"شری کریشنا"(خودای عەشق) کە لە راستیدا جیلوەی دەرەکی قولاّییەکانی خودی ئەوە" فێربێت. ئارجۆنا پیاوی کردەوەیە و حەزی بە ئەودیوی سروشت و تیۆرە سست و بێ بنەماکان نییە. ئەو دەیەوێت بزانێ چۆن دەتوانرێ سات بە ساتی ژیان لە هەر جۆرە ترس و نیگەرانییەك پڕ بەرهەم و خاوێن بکرێتەوە. پرسیارەکانی، کۆمەڵێ پرسیاری کارەکین سەبارەت بە گرفتەکانی ژیان. وەڵامەکانی شری کریشنا-ش روون و سادەن; بە ئارجۆنادەڵێت:" مرۆڤ لە پێناو نەبەرددا دروست بووە، هیچ چارەیەکیشی نییە جگە لەوە. هەریەك لە خواستەکانی، راپێچی مەیدانی بەرەبەرەکانێی دەکات، بەڵام ئەو روخسەت پێدراوە کە چۆنیەتی نەبەرد و لایەنی نەبەردکەری خۆی هەڵبژێرێ. دەتوانێت رووی توڕەیی خۆی بکاتە خەڵکی دی، دەشتوانێ رووی بکاتە ئەو هەستی توڕەیی و خۆویستییەی کە لە دەروونیدایە. دەتوانێ لە دەستەکانی هەم بۆ لێدانی خەڵکی سوود وەرگرێ و هەمیش بۆ پاك کردنەوەی فرمێسك لە سەر روخساریان. ئەمە بە واتای بانگهێشتی مرۆڤایەتییە بۆ نەبەرد و لەم روانگەیەوەیە کە شری کریشنا لە گیتادا لە بەشێکی بەناوی "رێگای عەشق" نەك بە ئاوازێکی هەست و سۆزاوییەوە، بەڵکو بە ئاوازێکی حەماسییەوە وەسفی ژنان و پیاوانی قارەمان دەکات:





ئەو کەسە لای من بەڕێزە
کە ناخی بێگەردە لە بەدخوازی و
وەڵامی نەفرەت بە ئەوین دەداتەوە.
خەیاڵی- ئێمە- و — من- شوێنی لەودا نییە و
چێژ و سەختی لە روانگەی ئەوەوە یەکە.
خۆپارێز و میهرەبان و قایم و قوڵە
بە بەشی خۆی رازییە و بەخشندەیە
و دڵ و گیانی پێشکەشی من کردووە
کەواتە وەها کەسێك لای من خاوەن رێزە.
نە ئازار دەگەێنێت
نە دەش رەنجێ
لە شادومانی و کێبڕکێ و ترس
خۆی سەربەست کردووە.
چاك و خراپی ژیانی قەبووڵ کردووە
تەرکی گازندەشی کردووە.
دەروونی لە ناپاکییەکان خاوێن کردۆتەوە
یەخسیری ویست و خواستەکان نەبووە و گوێڕایەڵی فەرمانی منە.
ئەویینداری دۆست و دوژمنە
نە ئافەرینەکان مایەی هاندانن بۆی
نە، نفرینەکان بەربەستن لە رێگایدا.
لە گەرمادا چۆنە، لە سەرماشدا هەمان شێوە، لە مەینەتیدا هەروەك ئەوە وایە کە لە شادی دابێت
خۆی رزگارکردووە لە خۆشییەکان و لە ئابلۆقەی خۆویستییەکان

هاتۆتە دەرەوە
هیچ جەنگێك نییە لە دڵیدا و بڕوای بەهێزە
کەواتە وەها کەسێ لای من بە ڕێزە.

گاندی لە ئەفەریقیای باشووردا فێربوو کە چۆن ئەم ئامانجە گەورانە بکاتە کردەوە. لەوێ بوو کە لە ئاکامی هەوڵەکانی بۆ چاودێریکردنی بریندارانی شەڕی(بوێر)، هەستی پێکهێنانی دووەمین تیمی فریاکەوتنی تێدا هەڵقولا. ئەو تیمەی کە یارمەتیی حکومەتی(ناتال)ی دا بۆ هێورکردنەوەی ئەو کودەتایەی کە لە نێوان خەڵکی ناوچەی(زۆلۆ) سەری هەڵدابوو، بەڵام ئەمجارە لەم مەیدانەیاندا، هیچ جۆرە مایەی شانازییەکی بۆ خۆی بەدی نەدەکرد. ئەمجار بۆی دەرکەوت کە ناوی(کۆدەتا)، چ نەبوو جگە لە بەڵگەیەك بۆ دەسگیرکردنی خەڵکەکە. ئەم ڕاستییە، چاوانی گاندیی بە ڕووی وەی شوومەی شەڕدا کردەوە. هەموو بەیانییەك بەدەنگی گوللە وەخەبەر دەهات. سوپای بەریتانی هێرشی دەبردە سەر یەکە یەکەی گوندەکانی(زۆلۆ) و وێرانی دەکردن. لەم نێوەندەدا، گاندی و تیمە خۆبەخشەکەی هەندێ جار ناچار دەبوون ماوەی چل میل لە یەك ڕۆژدا بەپێ ببڕن بۆ گواستنەوەی زۆلۆییە بریندارەکان؛ ئەو بریندارانەی کە سەربازە کینەییە ئینگلیزەکان بێ بەزەییانە هێرشیان کردبووە سەریان. پوچی و بێ سوودی ڕەنج و مەینەتیان ئارامی لە بەر گاندی بڕیبوو. ڕۆژ و شەو هاوکات لەگەڵ هەڵگرتنی(نەخۆشبەرەکان)[٢٢] لە زنجیرە چیا دووورودرێژەکانی ناوچەی چۆڵی ناتاڵ، نوقمی دوعا و پاڕانەوە دەبوو، خەریك دەبوو بە لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی کردارەکانی خۆی. گاندی ڕاست و پاك لە قوڵاییەکانی دڵیەوە داخوازی هێزێکی زیاتری دەکرد بۆ خزمەتکردن.

---

٢٢- نقالە.







**لەگەڵ کاستوربای، پاش گەڕانەوەیان لە ئەفریقیای باشوورەوە بۆ هیند**

زەوق و شەوقی داخوازییەکەی بەرەو سەرچاوەی هێز ڕێنوێنی کرد. لە دۆخە قوڵەکانی مدیتەیشندا بۆی دەرکەوت کە بەشی هەرە گەورەی وزەی ژیانی لەبەندی مەیلی سێکسدا دیلە.

لە دۆخێکی کەشفکردن و بینینی ڕۆحیدا(شهود) بۆی دەرکەوت کە هێزی سێکسی تەنیا غەریزەیەکی جەستەیی نییە بەڵکو نموونەیەکە لە هێزە مەزنەکانی ڕۆح کە لە پشتی هەر ئەوین و داهێنانێکدا شاراوەیە، هەمان ئەو هێزەی کە لە نووسراوە هیندییەکاندا ناوی(کۆندالین)ی [۲۳] لێنراوە، بە واتای وزەی حەیاتیی کامڵبوون. لە تەواوی ژیانی رابردوویدا، مەیلی سێکسی، ئاغای بووە و گاندی بێ لە خواستی خۆی کێش کراوە بەدوویدا، بەڵام لە بێدەنگی چیاکانی ناتاڵدا بە پەنابردنە بەر زەوق و سۆزە ئاگرئاساکەی بۆ خزمەت کە چەندین هەفتە ئاگاداری کردن لە بریندارن و ئەوانەی لە دەمی مەرگدا بوون، چەندین بەرابەری کرد بوو، توانای دەرکێشانی ئەم هێزەی لەسەرچاوەکەیەوە لە خۆدا بەدی کرد. هەر لەوێ وای دانا کە خۆی، ببێتە ئاغای ئەو و ئیدی هیچکات روخسەتی فەرماندانی پێ نەدا. ئەم بڕیارە، گرژییەکانی لە قوڵایی دەروونیدا سڕییەوە و ئەو هەموو ئەوینەی کە لە دەروونیدا هەبوو رزگاری کرد و سپاردییە دەست ئیرادە- خواستی خۆی. بەم شێوە گاندی دەستی کرد بە گۆڕینی دوایین وزە هەوەسبازییەکانی بۆ وزەی ڕۆح.

23- Kundalini

# ریگای عەشق

لە ساڵی یەکەمی نیشتەجێبوونی لە ئەفەریقای باشوور، کە کارکردن بۆ کۆمپانیای داداعەبدولا پێویستی بەوە بوو کە بە شەمەندەنەفەر لە ویلایەتی ناتاڵەوە بۆ چەند ناوچەیەکی تری ولات هەندێ سەفەر بکات، ساتی بڕیاردان بۆ گاندی هاتە پێش. کۆچکەرە رۆژاواییەکان لە ئەفەریقیای باشوور هەمیشە بە شەمەندەنەفەری پلە یەك هاتوچۆ و سەفەریان دەکرد، وا باو بوو کە هیندییەکان بە شەمەندەنەفەری پلە سێ سەفەر بکەن، بەلام کۆمپانیای داداعەبدولا پسولەی پلە یەکی بۆ گاندی ئامادەکردبوو. گاندی کەلوپەلی خۆی هێنایە ناو فارگۆنەکە و تا شاری شاخاوی و بڵندی(ماریتز بۆرگ)[٢٤] بە تەنیایی و لە ئارامیدا درێژەی بە سەفەرەکەیدا. لەم شارەدا نەفەرێکی رۆژئاوایی چووە ناو فارگۆنەکەی گاندی، سەرنجێکی دایە ئەو پیاوە رەش پێستەی کە دانیشتبوو، بەپەلە لە فارگۆنەکە چووە دەرەوە و لەگەڵ پیاوانی شەمەندەنەفەرەکە گەڕایەوە. یەك لە کارمەندەکان بە گاندی گوت: "دەبێ لەم فارگۆنە بڕۆیتە دەرەوە، بڕۆ بۆ فارگۆنی پلەسێ." گاندی ناڕەزایی دەربڕی: "من پسولەی ئەم فارگۆنەم هەیە."

"هەقم بە سەر پسولەوە نییە، ئەگەر نەڕۆی بانگی پۆلیس دەکەم تا بتکەنە دەرەوە. "

گاندی، پەشۆکاوانە گوتی: "بانگیان کە، من مافی ئەوەم هەیە کە لێرە دانیشم، بە پێی خۆشم ناڕۆمە دەرەوە. " بەم شێوەیە پۆلیس گاندی لە شەمەندەنەفەرەکە

24- Maritzburg





دەرکردە دەرەوە; شەمەندەنەفەرەکە رۆیی و گاندی ناچار بوو کە شەو تا بەیان لە وێستگەی چۆڵ و تاریکی ماریتز بۆرگ بمێنێتەوە. پاڵتاو و جانتاکەشی دیار نەمابوون.



**کاتی کارکردنی وەك پارێزەرێك لە ژۆهانسبورگ، ساڵی ١٩٠٠**

سەرمای وشك، وەك تیخ مرۆڤی دەبڕی. هەر لەوێ لە تاریکایی و تەنیایدا دانیشت. دەلەرزی و لەگەڵ خۆیدا مشت و مڕی بوو، بۆ ئەوەی تێبگات چۆن یەکێك دەتوانێ لە ئازاردانی خەڵکی هەست بە خۆشحاڵی و ئاسوودەیی بکات. ئەو شتەی کە وەها ئاڵۆزی دەکرد، ئەو سووکایەتی و بە بچووك سەیرکردنە نەبوو کە بەرامبەر خودی وی دەکرا، بەڵکو دەردی بێ دەرمانی زوڵم و ستەم بوو کە مرۆڤ بە مرۆڤی

دەکرد و بە ڕەوای دەبینی؟ ئەو ئازار و ئەشکەنجەیەی کە بەهۆی ڕەنگی پێست یاخود بیرکردنەوەیان دەسەپێنرا بە سەر هاوڕەگەز و هاوتەوارەکانیدا.

تا بەرەبەیان بیری کردەوە و گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە گەڕانەوە بۆ هیندستان نیشانەی ترسنۆکییە. دەبێ لە ئەفریقیای باشوور بمێنێتەوە؟ گەڕانەوە شتێکی مەحاڵ بوو. دەبوا کارێ بکات و ئیستاکە ئیدی ئەو پیاوەی کە لە قسەکردن لە دادگادا بۆ بەرزکردنەوەی ڕێ وشوێنە پیشەییەکەی خۆیشی ناتەوان بوو، هێزی قسەکردن و نووسین و ڕێکخستنی کاریگەریی بۆ ئارام بەخشین بەدەرد و مەینەتی خەڵکیی لەخۆدا بەدی دەکرد.

لە پاش چەندین ساڵ، کاتێ پرسیاریان لەبارەی کاریگەرترین ڕووداوی ژیانییەوە لێکرد; بەسەرهاتی شەوی وێستگەی ماریتز بۆرگی گێڕایەوە. لەوە بەدواوە، زۆر دادگای تاقی کردەوە، بەسووکایەتی پێکردن و تەنانەت ئازاری جەستەییش ئازاردرا، بەڵام لەو شەوە دوور و درێژەدا لە چیاکانی ناتاڵدا بوو کە بڕیاریدا هیچکات تەسلیمی زۆر نەبێت و هیچکاتیش بۆ وەدەستهێنانی مەبەست پەنا نەباتە بەر زۆر.

"*من دژی ڕێگە توندوتیژاوییەکانم، تەنانەت گەر لە ڕێگەی چاکەشدا سوود لەم ڕێگانە وەربگیرێت، ئەو چاکی و خۆشییەی کە لە ئەنجامیدا دێتەکایەوە کاتییە و زوو تێپەڕ دەبێت، بەڵام ئەو نەهامەتی و شەڕەی کە دەرئەنجامیەتی، هەمیشەییە و دەمێنێتەوە.*"

" *من بڕوام بە ڕێگە ناوقەدبڕە توندوتیژاوییەکان نییە... هەرچەندیش سەبارەت بە ئامانجە بەهادارەکان هەست بەهاودڵی و ستایش بکەم، دیسانەوە دژی سازش نەخوازی و شێوازە توندوتیژاوییەکانم، تەنانەت لە ڕێگەی شەرافەتمەندانەترین ئامانجیشدا... ئەزموون منی فێرکردووە کە هیچکات خێری هەمیشەیی ناتوانێ و نابێت بەرهەمی توندوتیژی و ناڕاستی بێت.* "





لەپاش سیانزە١٣ساڵ، لە تەمەنی٣٧ ساڵیی گاندیدا، ئەم بڕوایە-کە سەرچاوەکەی لە دڵەوە بوو- کەوتە خونچەکردن و بووە ئیلهام بەخشی کۆمەڵەکی بەرەنگاربوونەوەی بێ توندوتیژی. گاندی خۆشحاڵ لە بڕیارەکەی خۆی سەبارەت بە تەرخانکردنی هەموو ژیانی بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگا، لە ئەرکی فریاکەوتن لەناوچە "شۆڕش کردووەکانی" زۆلۆ گەڕایەوە. بەخت چاوەڕێیی دەکرد. ڕژێمی سپی پێستی ترانسواڵ یاسایەکی نوێی پەسەند کرد کە بە پێی ئەو یاسایە، هندییەکانی نیشتەجێی ئەفریقای باشوور لە پاشماوەی مافە مەدەنی و یاساییەکانی خۆشیان بێبەش دەبوون. پەسەند کردنی (یاسای ڕەش)[25] بە واتای کۆتایی هاتنی ژیانی کۆمەڵگای هیندی بوو لە ئەفریقیادا.

لەسەر پێشنیاری گاندی کۆمەڵێکی گەورە لە هیندییەکان لە ژۆهانسبۆرگ بۆ بڕیاردان لەسەر چۆنیەتی شێوازی بەرەنگاری کۆبوونەوە. گاندی پلانێکی دیاریکراوی لەهزردا نەبوو؟ تەنیا ئەوەی دەزانی کە"مەرگ لە تەسلیم بوون بەم یاسایە باشترە." بەم حاڵەشەوە لەنێو ئەو جەماوەرە بەسۆز و خرۆشەدا کە ئامادە بوون پەنا بەرنە بەر هەرجۆرە توندوتیژییەك، دەتوت سروش(ئیلهام)ی بۆ هات کە پێشنیاری کار و کاردانەوەیەکی گەورەتر بکات بەهاوولاتییەکانی: خۆبواردن لە قەبوڵکردنی ئەم یاسا سووکایەتی پێکەرانە و قەبوڵکردنی ئاکامەکان بەبێ هیچ هەڵوێستێکی تۆڵەخوازانە" لە هەمان کاتدا بەبێ تۆسقاڵێ پاشەکشێ لە خواستی سەپاندنی ڕەفتاری یەکسان و دادپەروەرانە لە چوارچێوەی یاسادا. هەموو ئەو ژن و پیاوانەی کە لە کۆبوونەوەکەدا ئامادە بوون ڕازی بوون کە تا دوایین هەناسە لەسەر پەیمان بن بەرامبەر بە نەبەردی بێ لە توندوتیژی. گاندی لە دەستنووسەکانیدا بە دەنگێکی سەرکوتووانەوە نووسیویەتی کە: "شێوازێکی هاوسەنگ لەگەڵ شەڕ، بەڵام پشت ئەستوور بە ئەخلاق، پێی خستە مەیدانی بوون."

25- Blak act

*"نافەرمانی مەدەنییانە مافی هەر هاووڵاتییەکە. گەر دەست لە وەها مافێك بشۆین؟ دەستمان لە مرۆڤ بوون شۆردووە. نافەرمانی مەدەنییانە هیچکات نابێتە هۆی ئاژاوە. نافەرمانی ئاژاوەگێڕانەیە کە دەبێتە هۆی ئاژاوەنانەوە، هەر دەوڵەتێك بۆ پاراستنی خۆی، بە پەنابردنەبەر زەبر و زۆر، نافەرمانییە ئاژاوەگێڕانەکان سەرکوت دەکات، بەڵام سەرکوتکرنی نافەرمانی مەدەنی، هەوڵێکە بۆ بەندکردنی ویژدان.*



**وەك ساتیاگراهییەك لە ئەفریقیای باشوور، ساڵی١٩١٣**

*"پێویستیی مەدەنی بوونی نافەرمانی- گوێڕایەڵ نەبوون، بوونی ڕاستگۆیی، ڕێزگرتنی بەرامبەر- خۆپارێزی لە خووی هێرشبەری. وەها شێوازێك دەبێت لەسەر بنچینەی چەندین پرەنسیپی تەواو ڕوون بنیات نرابێت و دەمدەمی بوونی*





*میزاج شوێنی نییە تیایدا؟ لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە، نابێت نییەت خراپی و نەفرەت، لە پشتییەوە خۆی حەشاردابێت."*

بزووتنەوەکە بەخێرایی لە ئەفریقیای باشووردا پەرەی سەند. ئەو شتەی کە گاندی خستبوویە بەردەم هاونیشتمانییەکانی، شێوەیەکی ئەوپەڕی نوێی نەبەرد و خەبات بوو. بەڵگەهێنانەوەی ئەو ئەوەبوو کە لە بری پتر پەرەپێدانی ئاگری نەفرەت بەهۆی نەفرەتەوە، لەبری پتر پەرەدانی ئاگری توندوتیژی بەتوندوتیژی، بە پێشکەشکردنی سۆز و خۆشەویستی لەبەرامبەر کینە و، ڕێز لە بەرامبەر سووکایەتی پێکردن بە مەبەستێکی قورس و موحکەمەوە بۆ پاشەکشەنەکردن لە بەرەنگاربوونەوەی نەبوونی دادپەروەری، دەتوانرێ بەسەر ئیستسمار[٢٦] دا زاڵ بیت. ئەمە جۆرێك بوو لە بەرەنگاری کە ئەوپەڕی نەترسی دەویست و پێویستییەکەی پەیمانداندنێکی قووڵ بوو کە بەبوونی ئەمەش ئیدی، بوونی بەربەستە نابەردەوامەکان لەسەر ڕێگاکەیدا، هیچ بەرهەمێکی نییە جگە لە زیادبوونی هیمەتی بەرەنگار بوونەوە. بە هەزاران ژن و پیاو و منداڵ، دەستیاندایە یاخیبوونێکی ئاشکرا بەڵام ڕێکخراو، بە پیری بەندیخانەوە چوون و بە تاوانی نارەزایی لە بەرامبەر چەوسێنەرانی ئەفەریقیای باشوور بە بەندکردن سزادران.

یەك لە پێشکەوتنەکانی ئەو نەبەردەی کە گاندی گرتبوویە بەر، ئەوەبوو کە بووە هۆی چاوپێکەوتنی لەگەڵ سەرۆکی حکومەتی ترانسواڵ، ژنراڵ(جان سموتز)[٢٧]. لەوکاتەدا گاندی پایە سەرەتاییەکانی شێوازی نەبەردەکەی بنیات نابوو، کە پاشتر گەیشتە لوتکە. دەتوانین گاندی بێنینە بەرچاومان لە بەرامبەر

٢٦- exploitation: لە ئابووری و کۆمەڵایەتیدا بە مانای سوودوەرگرتن لە کاری کەسێکی تر دێت.

27- General jan smuts

ئەو کۆنە سەربازەی جەنگەکانی(بوێر) دانیشتووە و بە ئارامی دەڵێ: "من هاتووم بۆ ئەوەی بە جەنابتی ڕابگەیێنم کە نیازمە ڕووبەڕووی دەوڵەتەکەتان ببمەوە." بێ گومان سمۆتز بۆ ساتێ گومان لە گوێی خۆی دەکا و پاش کەمێ بەپێکەنینەوە دەڵێت: "واتە هاتووی بۆ ئێرە کە ئەمەم پێ بڵێیت؟ ئەگەر وتەیەکی تریش هەیە بیڵێ. " و گاندی دەڵێت: " بەڵێ، نیازم وایە لەم ڕووبەڕووبوونەوەیەدا سەرکەوتن وەدەست بێنم. "

سمۆتز زاڵ دەبێت بەسەر سەرسوڕمانەکەیدا و دەپرسێت:"ئێ زۆر چاکە، ئێستا چۆن دەتەوێ ئەم کارە بکەیت؟ " گاندی بە زەردەخەنەیەکەوە دەڵێت:" بەیارمەتی جەنابت."

لە پاش چەندین ساڵ، سمۆتز بێ ئەوەی کە مەبەستی گاڵتەکردن بێت، دانی پیادانا کە گاندی دەقاودەق ئەم کارەی ئەنجامدا. گاندی بە پەنابردنە بەر بێباکی و بڕیارە کاریگەری لێنەکراوەکەی و بەخۆپارێزی لە سوود وەرگرتنی بێ ویژدانانە لە هەلومەرجەکە و بەتایبەت بە پشت بەستن بە توانستە بێ سنوورەکەی لە تاوگرتنی لە بارودۆخەکاندا، بەبێ پاشەکشێ کردن و تۆڵەسەندنەوە، لە ئاکامدا توانی هەستی دۆستایەتی و ڕێزی ژەنراڵ سمۆتز لە بەرامبەر خۆی ببزوێنێ. بەم شێوەیە زاڵمانەترینی ئەو یاسایانەی کە بۆ هیندییەکان دادەگەێنرا، یەك لە دوای یەك ڕەتدەکرانەوە و کاری پێ نەدەکرا.

*"ڕاستی" حەقیقەت، لە دڵی هەموو مرۆڤێکدا هەیە، هەر کەسێك دەبێ لەوێ لە دوی بگەڕێ و بەو شێوەیەی کە خۆی لێی تێدەگات، بیکاتە چرای ڕێگەی. کەس مافی ئەوەی نییە کەسانی دیکە ناچار بکات بەپێی تێگەیشتنی ئەو لە ڕاستی، ڕێگایەك ببڕن."*





ساتیاگراها[٢٨] ئەو ناوەی کە گاندی داینا بۆ ئەم شێوازە نوێیەی زاڵبوون بەسەر نادادپەروەریدا، بەواتای"پابەندبوون بە ڕاستی" یاخود"هێزی ڕۆح"ە. وشەی ساتیا لە زمانی(سانسکریت)دا بە واتای“ڕاستی”دێت کە لە“سات”ەوە واتە ئەوەی کە هەیە، سەرچاوەی گرتووە. مانای شاراوەی پشت وشەی“ساتیا” ئەوەیە کە، تەنیا ڕاستییە کە بوونی هەیە؟ چونکە ڕاستی شتێ نیە کە تەنیا لە سات یا شوێنێکی تایبەتدا یا لەژێر کاریگەری هەلومەرجێکی تایبەتیدا ڕاستبوونی خۆی بسەلمێنێ، بەڵکو شتێکە کە قەت گۆڕانی بەسەردا نایەت.

گاندی دەیگوت: خراپە و نەبوونی دادپەروەری خۆی لە خۆیدا بوونێکی سەربەخۆیان نییە و تەنیا مادامەکی ئێمە پشتیوانییان لێ بکەین دروست دەبن. دادپەروەری بە بێ هاوکاری ئێمە-چ بەمەبەست و چ بێ مەبەست-، ناتوانێ درێژە بە بوونی خۆی بدات، وەها خەیاڵێك، پەروەردەیەکی ڕۆحی مەزنە کە لە پشت شێوازی هاوکاری نەکردنی بێ لە توندوتیژیدا بوونی هەیە.

تا ئەو کاتەی کە خەڵکی ئیستسمار قەبوڵ دەکەن هەم ئیستسمار چییەکان و هەم ئیستسمارکراوەکان لە بازنەی نەبوونی دادپەروەریدا گرفتارن، بەڵام هەر هێندەی کە ئیستسمارکراوەکان گەردنکەچی وەها پەیوەندییەك نابن و هاوکاری ناکەن، هەردوولا سەربەست دەبن.

28- Satyagraha



**لەگەڵ (هێرمان کالنباخ)، یەك لە شوێنکەوتووانی، لە وێستگەی شەمەندەنەفەری ماریتیزبۆرگ و لەکاتی خەباتی ساتیاگراهادا**

گاندی حەوت ساڵ شێوازی ساتیاگراهای لە ئەفریقای باشووردا تاقی کردەوەو تەنانەت لە وڵاتێکی بێگانەشدا و لە بەرامبەر حکومەتێکی بەهێز و کینەخوازدا کاریگەرییەکەی خستەبەرچاو. کاتێ کە شێوازی تاقیکراوە و کاریگەری بەرەنگاری بێ لە توندوتیژی لەگەڵ خۆ دەهێنایەوە بۆ هیند، گومانی نەبوو کە دەتوانێ نیشتمانەکەی لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیا بەبێ پەنابردنە بەر شەڕ و توندوتیژی ڕزگار بکات، بەو مەرجەی کە خەڵکی هیند پێشەوایەتی ئەو قەبوڵ بکەن و مەرجەکانی نەبەردی بێ لە توندوتیژی بێ کەم و کوڕی ڕەچاو بکەن. ناوبراو لە بەرامبەر گەلەکەیدا دەیگوت:"ئامانجی خۆتان بەڕوونی دیار بکەن و بە لە خۆبوردەیی و بەبێ چاوەڕێی بچووکترین چێژ یا





سوودی تاکەکەسی و بە پەنابردنە بەر شێوازە پاکەکان، وەدەستی بێنن. تەنانەت ئەگەر لە یەکەم تێڕوانیندا، گەیشتن بەسەرکەوتن لە ڕێگەی توندوتیژییەوە بەشێوەیەکی لەسەداسەد ئاشکرا بێت دەستی بۆ مەبەن، چونکە جگە لە دەرەنجامی پێچەوانە هیچ ئاکامێکی تری نییە. چەکی ئەوین و ڕێزگرتن، لەگەڵ بەرامبەر بەکاربێنن، هەرچەندە ئەم ئامانجە دوور و نادڵنیا خۆی نیشان بدات. دڵ بدەنە نەبەرد و هیچ بەهایەك بە زۆر دامەنێن بۆ هەوڵدان لە پێناو کامەرانی گەل؟ ئەوەش بزانن کە هەر ناکامی و شکستێك ئێوە ڕێنوێنی دەکا بەرەو کانگا قوڵترەکان لە قوڵایی بوونتاندا. هیچکات توندوتیژی توندوتیژی لەناو نابات، بەڵکو تەنیا بەتاوتری دەکا؟ لە کاتێکدا کە، بە پابەند نەبوونی بێ کەم و کوڕی بە ناتوندوتیژی، لە هزر و وتە و ئاکاردا، گەیشتن بە ڕزگاری لەسەدا سەدە."

(جەی، بی، کریپالانی[29])ی - مێژوونووس- کە پاشتر بووە یەکێك لە هاوکارانی نزیکی گاندی، دەڵێت کاتێ کە بۆ یەکەم جار گوێبیستی ئەم وتانەی گاندی بووم، وەها هەژام یەکسەر چوومە پێش و ڕووڕاسانە گوتم:" بەڕێز گاندی، لەوانەبێت بەڕێزتان باش شارەزای ئینجیل یا بهاگاوادگیتا بن، بەڵام هیچ لە مێژوو نازانن، هیچکات هیچ میللەتێ نەیتوانیوە بەبێ پەنابردنە بەر توندوتیژی سەربەخۆیی و ئازادی وەدەست بێنێ."

گاندی بە نەرمی و بەدەم بزەیەکەوە، وتەکەی منی وەها ڕاست کردەوە:

"جەنابتان هیچ لە مێژوو نازانن، یەکەم شت کە دەبێت لە مێژووەوە فێربیت ئەوەیە کە ڕوونەدانی شتێ لە ڕابردوودا، بەو واتایە نییە کە لە ئایندەشدا ڕوونەدا.

29- J.b.kripalani

*"لەم سەردەمەی سەرسامییەکاندا کەس ناتوانێت بانگەشەی ئەوە بکا کە دیاردەیەك یا بیروبڕوایەك بەهۆی ئەوەوە کە نوێیە بێ بەهایە. ئەو لێکدانەوەیەش کە گەیشتن بە ئامانج بەهۆی سەختبوونی ڕێگەکەیەوە سەختە، لەگەڵ ڕۆحی سەردەمی ئێمەدا ناسازگار و نەگونجاوە. ڕۆژانە شاهیدی کۆمەڵێ ڕوداوین کە بە خەیاڵیشماندا نەدەهاتن، نەکراوەکان ڕۆژانە دەبنە کراو. ئەمڕۆکە دۆزینەوە سەرسوڕهێنەرەکانی بواری توندوتیژی، خێرا و یەك لە دوای یەك سەرسامان دەکات، بەڵام بۆچوونی من وەهایە کە دۆزینەوە باوەڕپێنەکراو و بەرواڵەت نەکراوەکان لە بواری نەبوونی توندوتیژیدا، زۆر زیاتر روو دەدات."*

ساتیا و ئەهیمسا[٣٠]، (ڕاستی و نەبوونی توندوتیژی)، بوونە دروشمە هەمیشەییەکانی گاندی. ئەم دووە لەسەر بنچینەی ئەزموونەکانی گاندی"دوو ڕووی سکەیەك" و دوو جۆر تێڕوانین بوون بۆ یەك ڕاستی تاقیکاری. لە ڕوانگەی ئەوەوە ساتیا بە واتای قوڵترین ڕاستیی-بوون- بوو، ئەو ڕاستییەی کە ژیان، گشت-ێکی یەك-ە. بودا وەها ئەم خاڵە دەر دەبڕێت:" کاتێك کە تاکێ ڕقی لە یەکێکی دی دەبێتەوە، ئەمە خودی ئەوە کە تووشی نەخۆشییە جەستەیی و هەستی و ڕۆحییەکان دەبێت. کاتێ کە ئەوین دەبەخشێ، دیسانەوە خودی ئەوە کە دەبێتە"گشت"ێك، نەفرەت دەکوژێ و نابود دەکات؟ عەشق، چارەسەر(شفا) دەبەخشێ."

30- Ahimsa







**لەگەڵ (سارۆجینی نایدۆ)ی یەك لە بەئەمەکترین هاوڕێکانی لەکاتی ڕێپێوانی(خوێ) لە ساڵی١٩٣٠. پاش گیرانی گاندی لە نیوە شەوی چوارەمی مانگی ئایاری١٩٣٠، سارۆجینی وەك جێگری گاندی ڕێبەرایەتی ٢٥٠٠ساتیاگراهیی کرد لە سەختترینی خەباتە ڕزگاریخوازانەکاندا**

ساتیاگراها واتە"پابەندبوون بەم حەقیقەتە" لە هەموو بارودۆخێکدا، بەبێ گرنگیدان بە ڕادەی هێزی تۆفان. لەو ڕوانگەوە کە(ساتیاگراهی[٣١] یەکی ڕاستەقینە، هیچی بۆخۆی ناوێت، لەپێناو کامەرانی گەلەکەی، لە چوونە نێو هەر بەربەرەکانێیەك چ ترسێك ناخاتە دڵەوە. ئەو بەبێ هەستی دوژمنایەتی لە دڵدا و بێ هەستی تۆڵەسەندنەوە و تەنانەت بەبێ پەنابردنە بەر وتەی توندوتیژ، خۆی دەسپێرێتە دەست بەربەرەکانی. تەنانەت لە کاتی

٣١- شوێنکەوتووی شێوازی ساتیاگراها.

ڕووبەڕووبوونەوەی توندترین هەڕەشە و گوڕەشەکانیشدا، قەت لە بیری ناکات کە خودی خۆی و هێرشبەرەکەی، واتە ئەو کەسەی کە هێرش دێنێتە سەری، هەردووك"یەکێکن". واتا ئەهیمسا زۆر قوڵترە لە تەنیا خۆپارێزی لە توندوتیژی. ئەهیمسا"ئەوینێکی قوڵ و پڕ سۆز"ە.

وشەی سانسکریتی ئەهیمسا بە پێچەوانەی وەرگێڕدراوەکەیەوە- ناتوندوتیژی- هیچ چەمکێکی کاردانەوەیی یاخود نیگەتیڤانەی نییە. ئەو شتەی کە وشەی ئەهیمسا دەری دەبڕێ ئەوەیە کە بە دامرکانەوەی هەموو توندوتیژییەکانی ناو دڵ، ئەو شتەی کە دەمێنیتەوە ئەوینە. ئەوین شتێ نییە کە ناچار بە فێربوونی بین؟ چونکە هەمیشە لەگەڵ ئێمەدایە و تەنیا دەبێ پەردەی لەسەر لاببرێت. سروشتی راستەقینەی ئێمە تەنیا ئەوە نییە کە ئەوین و خۆشەویستیمان هەبێت بۆ خەڵکی ئەملا و ئەولا لە گۆشە و کەنارەکاندا، بەڵکو ئەوەیە کە خودی ئەوین بین. ساتیاگراها ئەوینە لە کردەوەدا.

*"ئەو کەسەی ساتیاگراهییە، ماڵئاوایی لە ترس کردووە. کەواتە ئیدی قەت لە متمانەکردن بە رکابەرەکەی ناترسێ. تەنانەت گەر بیست جار بیخەڵەتێنێ، ساتیاگراهی ئامادەیە بۆ جاری بیست و یەکەم متمانەی پێبکات، چونکە متمانەی رەها بە سرشتی مرۆڤ، جەوهەری ئایینەکەیەتی.*







**لەگەڵ(سراستافۆرد کریپس)، نوێنەری حکومەتی بەریتانیا بۆ وتوێژ لەگەڵ ڕێبەرانی هیند بەدرێژای جەنگی دووەمی جیهانی**

*"ئەو شتەی کە لە ساتیاگراهادا گرنگی نەبێت چەندایەتییە، بەتایبەت لە کاتێکدا کە ژمارەی هێزەکانی ریزی توندوتیژی زیاتر بێت، چونکە"چۆنیەتی" چارەنووس دروست دەکات."*

*"ئەم بابەتەش زۆر کات لەیاد دەکرێ کە هیچکات مەبەستی ساتیاگراهی شەرمەزارکردنی تاوانکار نییە. هەروەها نابێت قەت پەنا ببرێتە بەرترسی ئەو؟ ئامانج یاخود ئەو شتەی کە دەبێ ئامانج بێت، دڵی ئەوە. ئامانجی ساتیاگراهی، گۆڕینی تاوانکارە، نەك سەپاندنی شتێ بەسەریدا. ساتیاگراهی لەهەموو کردەوەکانیدا، دەبێ خۆی بە دووربگرێت لە خۆدەرخستن و نمایشکردن. کرداری ئەو ئاساییە و هەڵقوڵاوی باوەڕی نێو دڵیەتی.*

*"ساتیاگراها لەسەرخۆیە و هیچکات نابێتە هۆی ئازار. دەرەنجامی توڕەیی یاخود بەدخوازی نییە، هیچ نزیکییەکی لەگەڵ هۆسە و هەراو بێ سەبریدا نییە.تەواو لە بەرامبەر زۆردایە و جێگرەوەی پڕ بەپێستی توندوتیژییە."*

ئەهیمسا، "دارما"[٣٢] ی ئێمە و یاسای بنەڕەتی بوونی ئێمەیە. ئەهیمسا لە هەموو خانەکانمادا، داچەقیوە، گاندی هەمیشە دەیگوت:"یاسای جەنگەڵ" تایبەتە بە ئاژەڵەکان" توندوتیژی، دارمای ئەوانە. بەڵام توندوتیژی بۆ مرۆڤایەتی، پێچەوانەکردنەوەی ڕەوتی کامڵبوونە و بزاوتێکە بە پێچەوانەی قوڵترین هزری زگماکییان، واتە ئەوین و لێبووردەیی و توانای بەخشین.

*"بەردەوام خۆمم بە لاواز بەرامبەر بە هەستی ڕقلێبوونەوە لە هەر بوونەوەرێك ڕاگرتووە. بە پەنابردنە بەر خوولە سەخت و درێژخایەنەکانی ڕەچاوکردنی ڕەوشت و لەگەڵ دوعاو پاڕانەوەدا، چل ساڵە کە نەفرەت و قینم بە رامبەر بە هیچ کەسێك لەدڵدا نییە. دەزانم کە ئەمە بانگەشەیەکی گەورەیە؟ لەگەڵ ئەمەشدا بەوپەڕی دڵفراوانییەوە وەها بانگەشەیەکم هەیە.*

٣٢- دارما لە مەزهەبی هیندوییزم و بوداییزمدا، یاسای تاهەتایی دنیایە کە ڕێنوێنیکاری ڕێگەی ڕاستە.







**لەگەڵ فەرماندەی بەریتانیی ناوچەی بەنگال، لەساڵی١٩٤٥. گاندی"بەرۆژوو-ی ئاخاوتن"ە و پرسیارەکان لە ڕێگەی نووسین وەڵام دەداتەوە**

*"بەڵام، بێزارم لە پیس و پۆخڵی لە هەر شوێنێکدا بێت، من بێزارم لەو سیستەمە حکومەتییەی کە ئینگلیزەکان لە هیند هێناویانەتە کایەوە. لە ئیستسماری بێبەزەییانەی هیند بێزارم. بە هەمان ڕادە کە لە قوڵاییەکانی دەروونمەوە رقم لەو سیستەمە پیس و بۆگەنەی "قێزەونەکان[٣٣]"ە کە ملیۆنەها هیندی پێیەوە دەناڵێنن، بەڵام بەهەمان شێوە کە هیچ قینێکم لە دڵدا نییە بەرامبەر بە "هیندۆس"ە فەرمانڕەوایخوازە قین لەدڵەکان، بە هەمان شێوەش هیچ رقم لە ملهوڕە ئینگلیزەکانیش نابێتەوە. من دەمەوێت بە پەنابردنە*

٣٣- هێمایە بۆ بیروبڕوای هیندییەکان بە (قێزەون- پیس) بوونی چینێك لە کۆمەڵگا.

*بەر ئەو شێوازە ئەویندارانەیەی کە لەبەر دەستمدایە، لە پێناو چاکسازییاندا تێبکۆشم. ریشە-کانی هەرەوەزی نەکردن لای من، لە عەشقدا خۆی حەشار داوە، نەك لە قین و نەفرەتدا."*

بەدرێژایی هەموو سەدەیەك لە دوای یەکەکان، چینە بالاکانی هیند لەژێر سێبەری ئالای سیستەمی چینایەتیدا، ملیۆنەها کەسیان لە چنگی راگواستن و زەبروزەنگی گەورەدا بەند کردبوو. گاندی کە لە رێگەی ئەزموونەکانی خودی خۆیەوە توانیبووی تێبگات لەو راستییەی کە"هەرچی بروێنی ئەوە درەوێنە دەکەی"، پەیوەندییەکی بەرتەسك و شاراوەی دانابوو لەنێوان ئیستسماری ملیۆنەها کەس کە لەلایەن هیندییەکانەوە کەوتبوونە نێو بەدبەختی و هەژارییەوە لەگەڵ ئیستسماری خەڵکی هیند لەلایەن بەریتانیای گەورەوە، یەك لە هەنگاوەکانی لە بۆ گەڕاندنەوەی هەستی باوەڕ بەخۆ هەبوون لەلای هیندییەکان و هێنانەکایەی یەکگرتوویی لەنێوانیاندا، هەوڵدان بوو بۆ ئازادبوونی ئەم چینە ژێردەستە لە کۆمەڵگای هیندیدا. وشەی''سانسکریت'' کە لە سەرەتادا بۆ ناونانی ئەم کەسانە بەکار دەهات، بە واتای''قێزەون و پیس'' بوو. خودی ئەم ناوە، هەستی سووکایەتی و شەرمی تیایاندا دەهێشتەوە، بەلام گاندی بە یەك شەو ئەوانی گۆڕی و ناوی''هاریجن'' -مندالانی خودا-ی لێنان.

پانتایی نەبەرد و خەباتی گاندی چیاکانی هیمالایا تا دوورگەی(سیلان)(٣٤) ی گرتەوە. پەیامەکەی لە هەموو شوێنێك یەکسان بوو:" هەموو ئێمە یەکین. بە سەپاندنی ئازار و مەینەت بەسەر خەڵکدا، بەسەر خۆماندا سەپاندوومانە. بەلاوازکردنی خەڵکی، خۆمان و گەلەکەمان لاواز کردووە". هەندێ جار بە نەچوونە ئەو پەرستگایانەی کە بە درێژایی چەندین سەدە دەرگاکانیان بە ڕووی عابد(لەخواترس)ە هندییەکاندا داخرابوو، هەموو هیندی شەرمەزار دەکرد و بەو جەماوەرەی کە بۆ گوێگرتن لە وتەکانی کۆبووبوونەوە

٣٤- سریلانکای ئێستا.





دەیوت:" خودا لەم شوێنەدا نییە، گەر لێرە دەبوو، هەمووان روخسەتی چوونە ژوورەوەیان دەبوو، چونکە ئەو لە ناخی هەمووماندایە." بەهۆی ئەو خۆشەویستییەوە کە خەڵك هەیانبوو بۆی، وتەکانی هەتا قولاییەکانی دەروونیان دەچووە خواریێ، بەم شێوەیە، لەپاش چەندین سەدە، دەرگای ماڵ و پەرستگاکان لەسەرتاپای هیندا بەڕووی هەموو خەڵك کرایەوە.



**کاتی مەراسیمی پاڕانەوە لە گوندێکی بچووك لە ویلایەتی نواخالی، کاتی ئاژاوەکانی هیندۆس و موسوڵمانەکان لە ساڵی١٩٤٦**

هەنگاوی دەنایە هەر جێگەیەك پارەی بۆ هاریجنەکان کۆ دەکردەوە. لەو رۆژگارەدا ژنانی چینی ناوەند، بەتایبەت ژنە دێهاتییەکان، هەموو زێڕ و زیوەکانیان دەکردە دەست و ملی خۆیان، پەندێکیش لەنێو خەڵکیدا باو بوو، کە باشترین بانکی پیاوان

ملی هاوسەرەکانیانە. گاندی وەها رەفتارێکی بە کەمێك خۆ بە گەورەزانین و شانازی بەخۆوەکردن دەزانی، ئەویش لەکاتێکدا کە بەشی هەرە گەورەی ولات لەبرسێتی و هەژاریدا ژیانیان دەبردە سەر، سوودی لەهەر ماوەیەك وەردەگرت بۆ هاندانی ژنان، کە گوارە و بازن و ملوانکەکانیان ببەخشنە بزووتنەوەی خزمەتکردنی هاریجنەکان، تەنانەت مندالانیش لە دەست"شای گەدایان"پارێزراو نەبوون. گاندی هێزێکی کێشکردنێکی وای هەبوو کە کاتی گەیشتنی شەمەندەنەفەرەکەی لە هەر کاتژمێرێکی شەو یاخود رۆژدا، جەماوەرێکی زۆری پیر و لاو و مندالی لە چاوەڕوانی خۆیدا دەبینی بۆ ئەوەی پارەو زێڕ و زیوەکانیان بکەنە دەستی ئەو کە بۆ داواکاری درێژ ببوو.

لە هیند شەمەندەنەفەرەکان سێ پلەیان هەیە. لەو رۆژگارەدا فارگۆنە پلە یەکەکان تەنیا بۆ چینی دەسەلاتداری"بەریتانییەکان" تەرخان کرابوو، فارگۆنە پلە دووەکان تایبەت بوو بە چینە بالادەستەکانی کۆمەلگای هیندی و فارگۆنە قەرەبالغ و پیس و پۆخلە پلە سێ-کان، بە کورسی دارین و تەسکەوە، جێی زۆربەی هیندییە هەژارەکانی لەخۆدا دەکردەوە. گاندی یەکبوونی خۆیی لەگەل هەژارەکاندا بەشێوەیەکی بەرچاو و هەست پێکراو هێنابوویە دی ئەویش لەرێگەی هاوشێوەکردنی ژیان و گوزەرانی خۆی لەگەل ژیانی ئەوان، هەمیشە بۆ بەدواداچوونی شۆڕشەکەی بە فارگۆنی پلە سێ سەفەری دەکرد. جارێك کەسایەتییەك لە هۆکاری ئەم کارەی پرسییەوە، بە ساکاری وەلامی دایەوە:"چونکە فارگۆنی پلە چوارمان نییە!"







**کۆکردنەوەی یارمەتی بۆ بزووتنەوەی هاریجنەکان لە بەشی پلە سێی شەمەندەنەفەرێك**

لەماوەی ئەم سەفەرانەدا، رۆژێ "میسێونێر [٣٥] " ێك، بە دیمەنێکەوە کە دەری دەخست ژیانێکی ئاسوودەی هەبوو، داوای لە گاندی کرد بۆ رێنوێنی کردنی بۆ چۆنیەتی خزمەتکردن و هاوکاریکردنی دەرکراوەکانی چینە هەژارەکان؟ لە لادێکانی هیند. وەلامەکەی گاندی رێك بناغەی ژیانی وی خستە بەر دوودلی و گومانەوە:"دەبێ لە شوێنگەی خۆمان بێینە خوارەوە، نەك وەك چاودێرێك لە دوورەوەڕا، بەلکو وەك یەکێك لە ئەوان لە ناویاندا بژیین؟ دەبێ خۆمان بکەینە شەریکی هەموو خەم و خەفەتەکانیان."

٣٥- بانگەوازکار و مژدەبەخشی ئاینی.

ئەمە، رۆحی دیدگای گاندییە. بەڵام لە هەمووی گرنگتر، ئەوەیە کە بۆ فێرکردنی خەڵك، خۆی دەکردە پێشەنگ. ئەو خۆی، لەگەڵ"هاریجن"ە کان ژیا، بۆ هاندانیان بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی تەندروستی و سەلامەتییان، بوو بە خزمەتکاریان؟ سەدان هەزار نەفەر لە شوێنکەوتوانیشی بۆ ژیان لەگەڵ خەڵکی، خانووەکانیان لە گوندە هەژارنشینەکانی سەرتاسەری هیند دروست کرد و بە ئاکاری خۆیان خەڵکیان بۆ گۆڕینی بارودۆخی ژیانیان هان دەدا. ئەمانە خەڵکیان فێر کرد کە چۆن لە بازنەی داخراوی نەزانی و بەدبەختی و خورافە و هەژاری، کە دەرنجامی سێسەد ساڵ ئیستیعماری بێگانەکان بوو رزگاربن. جارێك گاندی لە نامەیەکدا کە بۆ یەکێ لە هاوکارەکانی کە ئافرەتێکی بەریتانی بوو بەناوی مریبار نووسی، گەر دەکرا بەبێ لابردنی شاخی بەریتانیا لە هیندستان مەینەتی و رەنجی خەڵکی هیندستان هێور و کەمبکاتەوە، قەت بۆ سەربەخۆیی ولاتەکەم دەستم نەدەدایە نەبەرد و هەر وەفادار دەمامەوە بەرامبەر بە ئیمپراتۆریەتی بەریتانی. بەڵام فەقیرەکان بوون کە پتر لە هەموان، ئازاریان لە دەست دەسەڵاتی ئینگلیز دەچەشت؟ کەواتە لەبەر ئازادی و رزگاری ئەوان بوو کە گاندی سەرەنجام بۆ گەیشتن بە ئازادی راکێشرایە مەیدانی نەبەردەوە.

*"بۆ دیتنی راستەوخۆی رۆحیی گشتگیر و جیهانگیری راستی، دەبێت دروست بە ئەندازەی خۆمان، توانای خۆشەویستی- عەشق بەخشینمان هەبێت بەرامبەر بە بچووکترین بوونەوەر-خلقەت-، ئەو کەسەی کە وەها شەیداییەك لەسەردا تاووتوێ دەکات، هیچکات ناتوانێ خۆی لە هیچ یەك لە بوارەکانی ژیان بە دوور بگرێ؟ لەم رووەوە یەکەم عەودالی من بەرامبەر راستی، منی راپێچ کردۆتە نێو جیهانی سیاسی. بەبێ بچووکترین گومان و لە هەمان کاتدا بەوپەڕی گەردنکەچییەوە دەتوانم بڵێم ئەوانەی گوایا وا بیردەکەنەوە کە ئایین(مذهب) پەیوەندی بە سیاسەتەوە نییە، لە واتای دین تێنەگەیشتوون.*





لە سەرەتای قۆناغی خەباتە سەربەخۆییخوازانەکەی گەلی هینددا، رووداوی زۆر تاڵ و سەخت روویدا کە لاپەڕەکانی مێژووی بەریتانیا لەککەدار دەکا. لە شەڕی جیهانیی یەکەمدا، کاتێ گاندی لە ئەفەریقیای باشوورەوە گەڕایەوە هیندستان، حکومەتی سەربازی زاڵ بوو بەسەر هیندستان و ولات لە دڵەڕاوکێ و هەڕەشەی شۆڕشێکی توندوتیژاویدا بوو. بەڵام سەرەنجام ساتیاگراها وەك تاکە دەرمان و تەنیا چارەی رزگاربوون لە خراپکاری حکومەتی کۆلۆنیالیستەکان قەبوڵ کرا. هەزاران ژن و پیاو بەڵێنیان بۆ داوەتەکەی گاندی لەمەڕ هەرەوەزی نەکردن لەگەڵ دامەزراوەکانی حکومەتی بەریتانیا دەگوت و بەم شێوە بەندیخانەکان پڕبوو لە خەباتکارەکان، بڕیاری بەندکردنی دوورودرێژ دەردەکرا و سزاکان بە خێرایی ئەنجام دەدران، بەڵام هەر بەندکردنێك تەنیا دەبووە ئیلهام بەخشی باقی خەڵك بۆ دەستهەڵگرتن لە پلەو پایە حکومییەکان و نەدانی باج و پێشوازیکردن لە بەندیخانە بەشێوەیەکی خۆبەخشانە و سەرەنجام گاندیش بە تاوانی هاندانی ئاشوبگێڕان دەستگیر کرا. دادگاییکردنەکەی- تاکە دادگایەك کە حکومەت پێکیهێنا بۆی، بوو بە مینبەرێك بۆ راگەیاندنی تاوانی لەبەر چاو و قورس لە دژی ئیستسماری- **Exploitation**-ی بەریتانیا. خەڵکی هیند و هەموو جیهان دەیانبینی کە ئەمە، خودی ئیمپریالیزم بوو کە دادگایی دەکرا، نەك گاندی.

*"بەهیچ شێوەیەك نیازی شاردنەوەی ئەو راستییەم لە دادگا نییە کە وتار و دروستکردنی دژایەتی بەرامبەر بە سیستەمی حکومەتی ئێستا، تارادەیەکی زۆر بۆتە هەموو دڵ مەشغوڵییەکی من...*



**ساڵی ١٩٣٤، ویلایەتی بیهار**

*"دانیشتوانی شارەکان بە دروستی نازانن کە کۆمەڵە نیوە برسییەکانی هیند چۆن ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لاوازتر و ڕەنگ زەردتر دەبن. ئەوان بە دروستی نازانن کە بۆ ئەو تۆزە خۆشگوزەرانییەیان قەرزارباری هەقی ئەو دەڵاڵییەن کە لە بەرامبەر کارکردن لە بۆ کۆلۆنیالیستەکان لێیان وەردەگرن و نازانن کە ئەم حەقی دەڵاڵی وسوودانە، لە مژینی خوێنی ئەو کۆمەڵانەوە هاتۆتە کایەوە. ئەوان بە دروستی ئاگادارنین کە ئەو حکومەتەی کە لەسەر بنچینەی یاسا لە هیندستانی بەریتانیادا هاتۆتەکایەوە، هەر بۆ ئیستیسمارکردنی ئەم کۆمەڵانە هاتۆتەکایەوە. هیچ جۆرە چاوبەست و گومڕاکردن و دەسکارییەك لە ژمارە و ئامارەکاندا، ناتوانێت بەپشتگوێ خستنی مردووە*





*جوڵاوەکان کە لە زۆرێك لە گوندەکان بە چاوی ئاسییش دەبینرێن یارمەتی ئەوان بدات.*

*"دەمەوێت بە ناساندنی شێوازی هاوکاری نەکردن، ڕێگەی دەربازبوون لەو دۆخە نائاساییە نیشان بدەم کە هەم هیندییەکان و هەم بەریتانییەکان تیایدا دەژین. بەم شێوەیە خزمەتی هەردوولام کردووە. بەڕای من بە هەمان رادە کە هاوکاریکردن لەگەڵ خێر ئەرکی هەموو مرۆڤایەتییە، هاوکاری نەکردن لەگەڵ شەڕیش ئاوهایە. بەڵام شێوازی هاوکاری نەکردن لە رابردوودا بەشێوەی ئەنجامدانی توندوتیژی لە بەرامبەر خراپەکاران دەرکەوتووە. هەموو هەوڵی من ئەوەیە کە بە هاووڵاتییەکانم بسەلمێنم هاوکاری نەکردنی تێکەڵ بە توندوتیژی بەرهەمێکی نییە جگە لە، پەرەدان بە خراپە و بەهەمان شێوە کە شەڕ تەنیا بە پەنابردنە بەر توندوتیژی بەردەوام دەبێت، خۆ بەدوورگرتن لە پشتگیریکردنی شەڕیش، پێویستی بە خۆ بەدوورگرتنی تەواوە لە پەنابردنەبەر توندوتیژی.*

*"ئەو شتەی کە خەباتی ناتوندوتیژی پێویستیەتی، قەبوڵکردنی ئەو سزایانەیە کە دەرەنجامی هاوکاری نەکردنە لەگەڵ خراپەکاران. کەواتە ئێستا کە من لەم شوێنەدا ئامادەبووم بۆ ئەوەی بەشادی و خۆشحاڵییەوە لەبەر ئەو شتەی کە لەسەر بنچینەی یاسا بە تاوانی ئەنقەست لە قەڵەم دەدرێ بەڵام بەبۆچوونی من مەزنترین ئەرکی هەموو هاووڵاتیانە قورسترین سزاکان قەبوڵ بکەم- ئەی جەنابی دادوەر و کارناسانی دادگا- لەبەردەم ئێوەشدا دوو ڕێگە زیاتر لە ئارادا نییە.*



**ساڵی١٩٣٦**

*ئەگەر هەستتان پێتان دەڵێ ئەو یاسایانەی کە کارپێکردنیتان گرتۆتە ئەستۆ لە بۆ یارمەتیدانی شەڕ و خراپەیە و من بە راستی بێگوناهم، دەست لە پۆستەکانتان هەڵگرن و بەم جۆرە خۆتان لە شەڕ و خراپە پاك بکەنەوە، ئەگەریش بڕواتان وایە کە ئەم سیستەم و یاسایانە کە ئێوە یارمەتی کارپێکردنی دەدەن بۆ بارودۆخی گەلانی ئەم وڵاتە بەسوودە و چالاکییەکانی من پەکخەری بەرژەوەندییە گشتییەکانە، قورسترین سزام بۆ دەرکەن"*





هەر لەم ساڵانەی سەرەتای بزووتنەوەی هەرەوەزی نەکردنەدا بوو کە گاندی دڵسۆزترین برادەر و هاوکارانی بۆ خۆی راکێشا، چەندین ژن و پیاو بە پێشینەی جیاواز و لە نەتەوەی جۆراوجۆر کە هەموو خاوەن یەك ئەزموونی هاوبەش بوون، هاتبوون کە لە نزیکەوە گاندی ببینن، بەڵام نیشتەجێ ببوون و خۆیان لە بۆ خزمەتکردن تەرخان کردبوو. تەنها یەکجار دیتنی، بەس بوو بۆ ئەوەی ئەو کەسە ببێتە قارەمانێك، هەر ئەم پیاوە وردیلەیە ژیانی چەندین ژن و پیاو و تەنانەت منداڵیشی بە تەواوی گۆڕی بوو؟ ئەو شتەی کە ئەو لەهەموانی دەویست و لێی دەسەندن، باڵاترین پلەی لەخۆبردوویی و ئەوین بوو. تەنانەت دوژمنەکانیشی لە هێزی کێشکردنی پارێزراو نەبوون. کاتێك کە نائب السلطنه نوێکان، لەلایەن حکومەتی بەریتانیاوە بۆ هیند دەنێردران بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتییەکانیان لە هیند بگرنە ئەستۆ، ئاگادار دەکرانەوە کە"لە گاندی نزیك نەبنەوە، دەتانگرێ"! جەواهر لەعل نەهرۆ لە یەکەمین ئەو کەسانە بوو کە تووشی ئەم چارەنووسە بوو. باوکی ناوبراو، موتی لەعل نەهرۆ، پارێزەرێکی بەهێز و سەربە خێزانێکی زۆر نوێخواز و دەوڵەمەندی هیندۆسی بوو. کاتێ کە جەواهر لەعل لە کامبریجەوە گەڕایەوە بۆ هیند، لاوێك بوو کە خووی بەیاری گۆبازی(چەوگان)[٣٦] و وەرزشی خلیسکێنە"ی سەربەفرەوە گرتبوو لە چیاکانی ئالپ و هیچ ئاشناییەکی لەگەڵ نیشتمانەکەی و گەلەکەی نەبوو، لەگەڵ ئەمەشدا و هەرچەندە لە ماڵەوە لەگەڵ داب و نەریتی بەریتانیاییەکان دەگونجا و دەژیا، بەڵام تەحەمولی حکومەتی بەریتانیای نەدەکرد. جەواهر لەعل هەر زوو پەیوەندیی بەو لاوە شۆڕشگێڕ و بەخرۆشانەوە کرد کە هەرەوەزی نەکردنی ناتوندوتیژییان، بەشێوازێکی زۆر خاو و سست دادەنا.

---

٣٦-جۆرە یارییەکە، کە بە دارێك دەکرێت کە لای کۆتایی دارەکە خوارە و لە تۆپێکی بچووکی دەدەن و  دوو جۆری پیادە و سوارەی هەیە کە بەسواری ئەسپ دەکرێت.

گاندی بە تەواوی ئەوی چەك كرد و بەم لاوەی دەگوت:"مادامەكی تۆ دەم لە شۆڕش دەكوتی، منیش خۆم خەریكی ڕێكخستنی شۆڕشێكم، كوێی توندوتیژی، شۆڕشگێڕییە؟ گەر بەڕاستی گەلەكەت خۆش دەوێ، یارمەتیم بدە با فێریان بكەم كە چۆن دەتوانن پشت لە توندوتیژی بكەن و تۆقاندن بخەنە لاوە."

ئەم وتانە لە دڵی نەهرۆدا جێی خۆی كردەوە. گرنگ نەبوو كە لە بەینی تێڕوانین و بیروبڕواكانی ئەو و گاندیدا چەند جۆر جیاوازی بەرچاو لە ئارادایە؟ مەزنی و شكۆمەندی ئەم پیاوە زۆر لەوەزیاتر بوو كە بتوانێ لە بەرامبەریدا ڕاوەستێ. نەهرۆ جل و بەرگە گرانباییەكان و نەریتە رووكەشییە جوانكارییەكانی خستەلاوە و هەموو دارایی و توانای خۆیی لە ڕێگەی بزووتنەوەی سەربەخۆیی خوازانەی گاندیدا، خستەكار.

ئەم گۆڕانكارییە بەلای باوكییەوە زۆر سەخت بوو. هەر شتێ كە بە پارە بكڕدرایە، موتی لەعل نەهرۆ بۆ هەرچی باشتر پەروەردەكردنی كوڕەكەیی رەخساندبوو، هۆگریی زۆری باوك بەكوڕەكەیەوە، بووە هۆی ئەوەی كە بە، بەلاوەخستنی هەموو ئەمانە لەلایەن كوڕەكەیەوە، زۆر بەسەختی دڵی بڕەنجێت. سەرئەنجام بۆ وتووێژێكی تایبەتی و بێپەردە چوو بۆ لای گاندی:"تۆ تاقە كوڕەكەمانت لێ سەندین، بمەدەرەوە با هەموو داراییەكەم بۆ خەرجیی شۆڕشەكەتان بخەمە بەردەستت."

گاندی بە دڵفراوانییەوە گوێبیست بوو، بەڵام تەنها سەری جوڵاند، بەپێكەنینێكی زۆرزانانەوە گوتی:" نەك هەركوڕەكەتان، بەڵكو خودی تۆ و هاوسەرەكەت و كچەكانت و باقی ئەندامانی خێزانەكەشتم دەوێت." و گاندی هەموویانی گرت، یەك بە یەك؟ ئەم كارەشی لە خودی-موتی لەعل-ەوە دەستپێكرد.

گاندی سەرسوڕهێنەرترین و نامۆترین ركابەر بوو كە هەر نەتەوەیەك لە بەرامبەر خۆیدا بینیویەتی. هەر بزاوتێكی وی لەخۆدا هەڵقوڵاو بوو؟ هەرساڵێك كە





رادەبوورد، گەنجتر و خێراتر و بە ئەزموونتردەبوو. جێگرەكانی شا لە هیند، لە دەستی ئەم پیاوە وردیلەیە توڕە و داماو ببوون. كاتێ هێرشیان دەبرد پاشەكشێی دەكرد، كاتێ پاشەكشێیان دەكرد، هێرشی دەبرد و دەتوت ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەهێزتر دەبوو. كەس نەیدەزانی كە بزاوتی پاشتر چی دەبێت، چونكە بزوێنەری كردارەكانی گاندی لێكۆڵینەوە و بەدواداچوونێكی سەرەتایی بێبایەخ و ڕێوشوێنی سیاسی نەبوو. بەڵكو ئیلهامێك لە قوڵایی دەروونییەوە، كە زۆربەی كات لە دوایین ساتیشدا دەهات، ڕێگەی پێ نیشان دەدا.

هەڵكەوتوترین و دیارترین شێوەی ئەم ئیلهامە، لە ڕووداوی "ساتیاگراهای خوێ"دا لە ساڵی١٩٣٠ بەدیاركەوت و سەرنجی هەموو جیهانی بۆ گاندی و گەلی هیند ڕاكێشا، تائەوكات خەباتكارانی بزووتنەوەی هەرەوەزی نەكرن جۆرێك لە ڕێكەوتنیان قەبووڵ بوو و تەنها بەدوای فەرمانرەوایی هیندەوە بوون وەك بەشێك لە ئیمپراتۆرییەتی بەریتانیا. ١٠ ساڵ بەسەر دەسپێكی ئەم بزووتنەوەیەدا ڕەت ببوو و بەریتانیای گەورە تادەهات زەبرو زۆری خۆی زیاتر دەكرد بۆ پتر تەنگ پێهەڵچنین و سەركوتكردن بەتوندترین شێوە بۆ زاڵبوون بەسەر گەلی هیندا. دروست ڕێكەوتی نیوە شەوی یەكەمی كانونی دووەمی ساڵی١٩٣٠، پارتی كۆنگرەی هیند ئاڵای گەلێكی نوێی هەڵدا و بەم شێوەیە، وڵات بۆ وەدەستهێنانی سەربەخۆیی تەواویی، چووە قۆناغێكی نوێی خەباتەوە.

گشت چاوەكان تیشكیان خستبووە سەر گاندی، كە ئایا ئێستا چی دەكات؟ دەسپێكی بزووتنەوەیەكی(ساتیاگراها)یی نزیك دەهاتە بەرچاو، بەڵام كەس، تەنانەت خودی گاندیش، وێنەیەكی لە چۆنیەتی یاخود كاتی دەسپێكردنیی لە هزردا گەڵاڵە نەببوو. چەندین هەفتە تێپەڕ بوو. هەڕەشەی ڕوودانی توندوتیژی پتر دەبوو، بەڵام گاندی هەر بێدەنگ بوو. حكومەت نە غیرەتی گرتنی هەبوو، نە دەیوێرا بەئازادی بیهێڵێتەوە، بەڵكو بێ سەبرانە چاوەڕێی دەكرد.

سەرئەنجام، پاش چەندین بیرکردنەوە، گاندی لە"ڕوئیا- خەیاڵدا"دا وەڵامی خۆی وەچنگ کەوت. ڕێگەچارە، لە ڕادەبەدەر سادەبوو. دەوڵەت، یاسایەکی بەسەر هیندییەکاندا سەپاندبوو کە بەپێی ئەو یاسایە، مافی بەرهەمهێنانی خوێیان لەدەریادا نەبوو؟ مافی تایبەتی بەرهەمهێنانی خوێ بە بەریتانییەکان درابوو، ئەمەش جگە لە وابەستەکردنی هیندییەکان لەڕێگەی ئەو شتەوە کە، لە وڵاتانی هێڵی کەمەرەیی زەوی لە پێویستییە سەرەکییەکانی ژیانە، هیچ ئەنجامێکی دیکەی نەبوو. گاندی وەها یاسایەکی بەنموونەیەکی تەواوی چەوسێنەریی چەوسێنەران دەزانی. پێشنیاری کرد لەگەڵ حەفتا و هەشت کەسی دیکە لە هەڤاڵانی دڵسۆزی، لە ئیشرامەکەی خۆیەوە بەرەو شاری بەندەری کەنارەیی بچووکی(دندی) بە ڕێپێوان وەرێکەون کە دەوروبەری ٢٤٠ میل لێیانەوە دوور بوو و لە لمەکانی دەریا خوێ بگرنەوە. بڕیاردرا بە ئاماژەی ئەو خەڵکی هیند وا ڕەفتار بکەن وەك ئەوەی کە هیچکات"یاسای خوێ" کاری پێ نەکراوە.

لەو بەیانییەدا کە پەیمانی درابوو، کۆمەڵێکی چڕ لەدەوری ئیشرامەکەی گاندی کۆبوونەوە، بۆ ئەوەی دواین دیمەنی ئەو جەستە ووردیلەیە ببینن کە لە ئان و ساتی ڕووخاندنی گشت سیستەمی فەرمانڕەوای سەر هیندستاندا بوو. ڕێپێوانە خرۆشییە مرۆڤ هەژێنەکە دەستی پێکرد. پەیامنێرانی میدیاکان بۆ ئامادەکردنی هەواڵ و ڕیپۆرتاژەکانیان بەدرێژای ڕێگە جێگیر ببوون. گاندی شەست ویەکەمینساڵی تەمەنی تێدەپەڕاند، بەڵام ساغ وسەلامەتتر لە هەمیشە وەدیار دەکەوت، قارەمانێك بە هەنگاوە چوست و چالاکەکانی، ڕۆژی دوانزە میل ڕێگەی دەبڕی. لە هەموو گوندەکانی سەر ڕێگەی ڕادەوەستا و خەریکی ئامۆژگاریکردنی خەڵکی و ناساندنی مەرامی ئەهیمسا بوو، ئەرکی هەرەوەزی(هاوکاری) نەکردنی ناتوندوتیژییانەی لەگەڵ دەسەڵات بۆ ڕوون دەکردنەوە. بە درێژایی ڕێگەی ڕەتبوونی، خەڵکی لە خانووەکانیان دەڕژانە دەرەوە بۆ ئەوەی گاندی ببینن. لە جادەکانی نێوان شارەکان ڕیزیان دەبەست و





گوزەرەکەی ئەویان گوڵباران دەکرد. لەپاش بیست و چوار ڕۆژ، کاتێ گەیشتنە بەندەری دندی سوپا(هێز)ی ناتوندوتیژی، لە حەفتاو هەشت کەسەوە ببوو بە هەزاران کەس.

گاندی و شوێنکەوتووانی بە درێژایی شەو، دەستیان بە عیبادەت و پاڕانەوەکرد، بۆ ئەوەی خودا توانا و هێزی بەرەنگارییان بەرامبەر بە توندوتیژی پێ ببەخشێ کە، زۆر بەسانایی دەیتوانی وەها کۆمەڵ و جەماوەرێکی گەورە لەناو ببات، بەرەبەیان، لە بێدەنگیدا بەرەو ئاوەکان وەڕێکەوتن و گاندی، لە بەرامبەر هەزاران چاودا کە ئاگایان لە بچووکترین جوڵەی بوو، دانەوییەوە و مشتێ خوێی لە لم-ەکانی کەنار دەریا هەڵگرتەوە.

کاردانەوە زۆر خێرا بوو. لە گشت ناوچە کەنارەییەکانی هیندستان، چەندین کۆمەڵەی گەورە لە ژن و پیاو و منداڵ بەرەو دەریا چوون، بۆ ئەوەی بەکۆکردنەوەی خوێ، بەشێوەیەکی ئاشکرا ملکەچ نەبوونی خۆیان لەبەرامبەر ئەو یاسایانەی کە لەلایەن دەوڵەتی بەریتانیاوە دەسەپێندرا نیشان بدەن، خوێی قاچاغ بە بەرزترین نرخ فرۆشرا و خەڵکی شارەکانیش بە کڕینی، لە شکاندنی یاساکەدا بەشدار بوون. هەموو خەڵکی وڵات دەیانزانی کە خۆیان لە بەندو زنجیر دەرباز کردووە، هەرچەند تۆڵەسەندنەوە دڕندەئاساکانی پۆلیسیش لە ئارادابوو، بەڵام خۆشی و شادی باڵی بە سەر وڵاتدا کێشابوو. لەپاش چەند مانگێك، کاتێ گاندی بەدەم خواردنەوەی چا-وە لەگەڵ(لۆرد ئیروین)[٣٧] دانووستانی دەکرد، لەگیرفانی ئەو قوماشەی کە لە دەوری خۆیی دەپێچا کیسەیەکی دەرهێنا، لەبەرامبەر چاوانی ڕاماوی(نائب السلطنة)دا، هەندێ لەو شتەی کە لە کیسەکەدا بوو کردە ناو کوپی چایەکەی. گاندی زۆرزانانە وەهای بۆ ڕوون کردەوە:"هەندێ لەم خوێیە دەکەمە ناو چایەکەم بۆ ئەوەی ببێتە

37- Lord irwin

هۆکاری خستنەوە یادی ڕووداوە بەناوبانگەکەی"میوانداری چای بۆستۆن"[٣٨]. لۆرد ئیروین بە ئەدەبەوە بەشداری لە پێکەنینەکەی گاندیدا کرد.

لەپاش ئیشارەتی گاندی،"نافەرمانی- یاخیبوونی جەماوەری" سەرتاپای وڵاتی گرتەوە و چەندین هەفتە درێژەی کێشا. هەزاران کەس خرانە بەندیخانەوە، ژمارەیەکی یەکجار زۆر بێ ئەوەی بچووکترین نیشانەی تۆڵەو توندوتیژییان تیا بەدیارکەوێ، بریندارکران و کوژران، بەڵام گاندی بەپێچەوانەی چاوەڕوانی هەموانەوە نەگیرا. ناوبرا بەتەنیا کاری ڕێکخستنی لەو بزووتنەوە بەربڵاو و پێشبینی نەکراوەدا بەرقەرار دەکرد کە نیمچە دوورگەی هیندی لە چیاکانی هیمالایاوە تا کەنار دەریای هێنا بووە جووڵە.

شەوێ لە پاش ڕەشبگیرییەکی بەکۆمەڵ، کۆمەڵێ لە ئۆردوگاکەی گاندیدا کە لە چەند چادرێکی بچووکی لەگەڵای درەختی خورما دروستکراو پێکهاتبوو، کە لە نێوان بەندەری دندی و دەریادا بوو بۆ پاڕانەوەی شەوانە لە دەوری یەك کۆبوونەوە. ئەو شەوە دەنگی قسەکردنی گاندی لە هەموو جارێ جدیتر بەدیار دەکەوت. لە پاش پاڕانەوە و گوتنی سرود، لەژێر ڕوناکی کزی لامپایەکدا، لیستێکی دوور و درێژ خوێندرایەوە کە ناوی گیراوەکانی لەخۆ گرتبوو.

---

٣٨- The Bostontea party:خۆپیشاندانێکی جەماوەری بوو لە ساڵی ١٧٧٣ لەشاری بۆستۆنی ئەمریکا ڕوویدا و بووە هۆی دەستپێکردنی جەنگە ئازادیخوازەکانی ئەمریکا. یاخیبوونی خەڵکی بۆستۆن، بەهۆی سەپاندنی باج بوو لەسەر چای، لەلایەن دەوڵەتی بەریتانیاوە و نەدانی مافی هەڵبژاردن لەپەرلەماندا بۆ خەڵکی بۆستۆن، هەندێ لە خەڵکەکەی، جلوبەرگی سوورپێستەکانی ئەمریکایان لەبەرکرد و چوونە نێو کەشتییەك و هەموو بارە چایەکانیان فڕەدایە نێو دەریا.





هەموو کاتێ لە پاش مەراسیم کۆمەڵ بڵاوەیان دەکرد و گاندی و هاوکارەکانی شەوانە دەحەسانەوە. بەڵام ئەو شەوە خەو نەچووە چاویان، دەستگیرکردنی گاندی نزیك دەهاتە بەرچاو و هەموو شپرزە و نیگەران بیریان لە سەلامەتی ئەو دەکردەوە.

نیوەشەو پیاوانی پۆلیس لەگەڵ ٣٠ سەرباز بە چەکی ئامادە و لەسەرپێوە، گەیشتنەجێ. لەو تاریکییەدا ناسینەوەی ڕوخساری گاندی شتێکی ئاستەم بوو و سەربازەکانیش نەیاندەتوانی بزانن کە ئەو لە کوێ خۆی شاردۆتەوە. سەرەنجام یەکێك لە پۆلیسەکان بوخچەیەکی سپی بچووکی لەتەویلەکاندا بینی و وتی:" گاندی لەوێیە." پێشەوای ئەو گرکانە نەتەوەییە لەوساتەدا وەك منداڵێك نوستبوو، بەدڵنیاییەکی ڕەهاوە پەروەردیگاری ئاگاداریەتی.

پۆلیسە ئینگلیزەکە خەبەری کردەوە و تیشکی لایتەکەی خستەسەر ڕوخساری: "ئێمە هاتووین بۆ دەسگیرکردنی بەڕێز(م،ك،گاندی)."

پیاوە وردیلانەکە بە ئەدەبەوە وەڵامی دایەوە:"موهانداس کرمچند گاندی منم؟ لە خزمەتتاندام."

پۆلیسەکە گوتی: "زەحمەت نەبێ شتومەکەکانت ئامادەکە، چەندت بوێت کاتت هەیە."

گاندی وەڵامی دایەوە:"من هەر ئێستا ئامادەم". ئیشارەی دا بە بوخچە بچووکەکەی سەر زەوی و: "هەموو ئەو شتەی کە پێویستمە ئەمەیە" و لەکاتێکدا پۆلیسەکە لێی دەڕوانی بەهەمان حاڵەتی ئارام و خوێن ساردی خۆیەوە، خەریك بوو بەشۆردنی ئەو چەند ددانەی کە مابووی. لە پاشان دوای عیبادەتێکی کورت، لەکاتێکدا بەشادومانییەوە لەگەڵ پاسەوانەکانی قسەی دەکرد، بەرەو ئۆتۆمۆبێلە چوو کە چاوەڕێی دەکرد. گاندی بەباشی دەیزانی کە لەوانەیە تا چەند ساڵێك گەڕانەوە لە ئارادا نەبێ، لەگەڵ ئەمەشدا کەمترین دەرەنجامی نیگەرانی یاخود ڕەنجان لە کرداریدا بەدی نەدەکرا. پۆلیسەکان وەها کەوتبوونە ژێر کاریگەری هێمنی و گەورەیی

و ساکاری ئەم پیاوە وردیلانەیە، کە دەتوت نەك پاسەوانی بەندیخانە بەڵکو بەندی-ی ئەوون. دەتوت گاندی لەکاتی ئازارچەشتندا، لەخۆشترین دۆخدایە و لەکاتی سەختی و زۆربۆهاتندا، لە بەهێزترین حاڵێدا بوو، گاندی چ لە بەندیخانەدا و چ لەدەرەوە بەردەوام مافی ئازادی خۆیی دەپاراست .

لەم کاتەدا پتر لە٦٠ شەست هەزار ساتیاگراهایی لە بەندیخانەکاندا بوون و سیمبولێ نموونەیی هەموویان گاندی بوو. بەندیخانە لە بۆ گاندی لەبری ئەوەی مایەی ئازار بێت، تاجی مەزنی ئەو بوو، ئەو دەیزانی توانای خۆڕاگری دلێرانە لە بەرامبەر سەختی لەپێناو هیوایەکی مەزندا، هێزێکە کە هیندییەکان دەگەێنێتە ئازادی. گاندی گوزەرانی نێو بەندیخانەی بەشادی و خۆشحاڵییەوە بەدەستکەوت دادەنا، خەڵکی سەرانسەری هیندستانیش بە ئیلهام وەرگرتن لەو، ترسانیان وەلاوەنا. بەندیخانەی ئینگلیزەکان بووە شوێنی جەژنی تازەکردنەوەی دیدارەکان و پێشەوا سیاسییە هیندییەکان، بەندیخانەیان بەشوێنی پەیوەندیکردن بە دۆستان و ناسیاوانی خۆیان دەزانی، گاندی بروسکەی پیرۆزبایی بۆ دەسگیرکراوەکان دەنارد و خۆیشی جار بەجار یەك لەدوای یەك زیندانی دەکرا. بەشێوەیەك کە بەردەوام یا لە بەندیخانە بوو یا تازە ئازاد دەکرا یا لەسەرەتای چوونە بەندیخانەدا بوو.

گاندی وەها لە دەوروبەرە ماددییەکەی چواردەوری جودا ببوویەوە کە بە هیچ جۆرێ بەندیخانە کاروباری دوا نەدەخست و لە پشت دیوارەکانی بەندیخانەشدا زۆربەی کارەکانی خۆیی رادەپەڕاند. ئەو دیوارانەی کە زۆربەی کات گاندی لە پشتییەوە بەند بوو، دیواری بەندیخانەی(یەراڤادا) (*) بوو. لەم بەندیخانەیەدا هێندە هەستی بە ئارامی دەکرد کە جارێکیان ئەفسەرێکی لێکۆڵینەوەی ئینگلیزی ناوونیشانی ماڵەکەی لێ پرسی، لە وەڵامدا گوتی:"یەراڤادا." ئەو کەسەی کە کارەکانی بەرۆحی پاڕانەوەوە ئەنجام دەدات، هەنگاو بنێتە هەرلایەك پیرۆزە. گاندی لە کۆتایی ئەو

(*)- Yeravada.





نامانەدا کە لە زیندانەوە دەینارد ناوونیشانی"پەرستگای یەراڤادا"ی دەنووسی. هەموو رۆژێ بەرلە خۆرهەڵات، خەریکی موکاشەفە و پاڕانەوە بوو و لەم رێگەیەوە بۆ بەرەنگاربوونەوە لە هەلومەرجە سەختەکاندا، داوای-وزە- هێزی دەکرد.



**چاوپێکەوتن لەگەڵ زیندانییە سیاسییەکان، ساڵی ١٩٣٩**

لە بەندیخانەدا ئینجیل و قورئان و بهاگاواد گیتای دەخوێندەوە و خەریکی لێپرسینەوەی نامەهاتووە زۆر و زەبەندەکانی رۆژانە دەبوو. ئیش و کارێکی پڕ لە چالاکی و جوڵەی لە پێش دابوو و دەبوا ئەو دوژمنانەی کە لەم دیو و ئەو دیوی میلەکانی بەندیخانەوە بوون، بکات بە دۆست و هاوڕێ. ئاگاداری هەموو بەندییەکانی دەکرد، تەنانەت لەکاتی نەخۆشیدا پەرستیاریان بوو. هەر رۆژێك کە لە بەندیخانەدا بۆ خزمەتکردنی خەڵکی تەرخان دەکرا،

ئاستی نەشونماکردنی رۆحیی گاندی و هەندێ لەوانەی باوەڕیان بە فەلسەفەی توندوتیژی نەکردن و سەربەخۆیی ولاَت هەبوو پەرەی دەسەند و روو لە زیادبوون بوو.

*"بۆ ساتیاگراهایی هیچ سنوربەندییەکی زەمەنی و هیچ سنووربەندییەك بۆ توانای بەرگەگرتنی سەختی لە ئارادا نییە و لەم رووەوە وشەی شکست لە فەرهەنگی ساتیاگراهاییدا بێ واتایە.*

"شادی، لەسەرکەوتندا نییە، بەڵکو لە خەبات و هەوڵدان و ئەو سەختیانەدایە کە لە ئەنجامیدا دێتە کایەوە.

*"لەنێو ئەزموونە سەختەکاندا وانەی بڵندی زاڵبوون بەسەر تووڕەییدا فێر بووم و زانیومە کە، هەروەك چۆن ئەگەر گەرما کۆنترۆڵ بکرێ دەبێتە وزە، بە هەمان شێوە گەر تووڕەییش کۆنترۆڵ بکرێت، دەتوانرێ بکرێتە هێزێك کە جیهان بهەژێنێ."*

بیرکردنەوە لەو تووڕەیی و نەفرەتەی کە دەیتوانی لە درێژەی خەبات بۆ سەربەخۆیی سیاسی ئاژاوە هەڵگیرسێنێ، کارێکی سەختە. هیندستان لە دەست داگیرکەریی بەریتانیا لە ئاگری تووڕەیی و قیندا دەسوتا و بەشێکی زۆر لە هێزی بەرەنگاربوونەوەی لە ڕەخنە و هێرشە پڕ خرۆشەکاندا بەبا دەچوو و هەولَی دەدا بە قین و تووڕەیی، رووبەڕووی لایەنی بەرامبەر بێتەوە. بەڵام گاندی ئەم تووڕەییەی لە رێگەی رەوشتی پۆڵاینی ساتیاگراهاییەکاندا بەکارهێنا. گاندی بە-خۆ بە سیمبولکردن، خەڵکی دیکەی فێرکرد کە دەتوانرێ لەگەڵ بوونی هەموو سەرچاوەکان، بێ روو لە توندوتیژی کردن، روبەڕووی حکومەتی بەریتانیا ببنەوە و لە هەمان کاتدا ئەوپەڕی رێز و خۆشەویستی لە دلَدا پەروەردە بکرێت بەرامبەریان. ئەو خۆی چاك دەیزانی کە زۆرێك لە وانەی بانگەشەی پەیڕەویکردن لەو دەکەن، توانای بەکارهێنانی ئەنجامدانی ناتوندوتیژییان نییە؟ بەم حاڵەشەوە هەرکاتێ کاری توندوتیژی لەلایەن کەسانێکەوە کە لە رێگە کینەییەکانەوە بەدوای ئازادیدا دەگەڕان سەری هەڵبدایا، خەباتی خۆی هەڵدەپەسارد. تەنانەت گەر یەك هەنگاویش لە سەرکەوتنەوە دوور بوایا. تەنیا





یەك جار کاری توندوتیژی بەس بوو بۆ ئەوەی واز لە رابەرایەتیکردنی خەباتی ساتیاگراهایی بهێنێ.

ئینگلیزەکان بە فراوانکردنی پانتایی سەرکوتکاریی هیندییەکان، وردە وردە تێگەیشتن کە بە بێبەشکردنی خەڵکی هیند لە ئازادییە سیاسییەکان، نەك هەر زیان بە هیندییەکان دەگەیێنن، بەڵکو زیان بە"ئینگلیزی زلهێز"یش دەگەێنن. باشترینی ئەو لاوانەی کە ئینگلیز دەیتوانی لە هەلومەرجێکی لەباردا پێیان بگەیێنێ و ئەو سەرباز و بازرگانانەی کە توانای دەربڕینی ئازایەتی و لەخۆبردووییەکی زۆریان هەبوو، کەوتبوونە داوی سەرکوتگەرییەوە و بە بیانووی فەرمانڕەوایی کردن بەسەر هینیدییەکانەوە دلّڕەقییان کردبووە پیشەی خۆیان. حکومەتی(بەریتانیای کەبیر) ناچار بوو هێزێکی زۆری مرۆیی تایبەت بکا بە پاراستنی گیان و سەرمایەی ئەم کەسانە. گاندی بڕوای وابوو کە ئینگلیزەکانیش بە چاوپۆشی لە کردارەکانیان، وەك هیندییەکان خوشك و برای ئەون. ئاوهابوو لەگەڵ داگیرکەراندا و پێی دەوتن:" ئێمە تاسەر، ئەم نایەکسانییە قەبوولّ ناکەین، نەك هەر لەبەر ئەوەی کە زیان لە ئێمە دەدا، بەڵکو لەبەر ئەوەی زیان لە ئێوەش دەدا." کەم کەم تەنانەت پیاوانی پایەبەرزی ئینگلیزیش کاردانەوەیان نیشاندا بەرامبەر بە روتێکردنەکەی گاندی و ژمارەیەکی زۆر لە هاوولاَتیانی ئینگلیز بۆ هاوکاریکردنی رێگەی وەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی هیندستان هاتنەلای.

*"پێم وایە کە گەر کەسێ بگاتە پلە هەرە بڵندە رۆحییەکان، هەموو جیهان لەگەڵ ئەو سەردەکەون و ئەگەر کەسێکیش شکست بهێنێ و بکەوێتە خوارەوە، گشت جیهانی هەرەس پێ هێناوە. قەت یارمەتی رکابەرەکانی خۆمم نەداوە، ئەوەندە نەبێ کە لە هەمان کاتدا یارمەتی خۆم و هاوکارەکانم داوە. "*



**خواردنەوەی چای لەگەڵ لۆرد لویس مۆنت باتن، (نائب السلطنة) لە هیند، لە شەوی سەربەخۆیی هیندستاندا**

کاتێك کە بەریتانیا بڕیاریدا "کۆنفرانسی مێزگرد" [٣٩] بۆ بڕیاردان لەسەر ئایندەی هیندستان ببەستێ، دیسانەوە گاندی لە بەندیخانەدابوو، "نوێنەران" ی هیند کە لەلایەن بەرپرسانی هەرە بەرزی ئینگلیزەوە بانگهێشت کرابوون، (مهاراجەها) و ئەو سیاسەتمەدارانە بوون کە بەشێوەیەکی گشتی لەژێر چەتری پشتگیری حکومەتی ئینگلیزدا بوون. (ستانلی جۆنز)[٤٠]، بانگەشەکاری ئایینی ئەمریکی و دۆستی گاندی، پاشتر بەخۆشحاڵییەوە دەیگێڕایەوە کە چۆن نوێنەری شای ئینگلستان لە هیندستان(لۆرد ئێروین)، رای ئەمی لەبارەی بانگهێشتکردنی گاندی پرسی بوو، بۆ کۆنفرانسەکە، ئەمیش وەڵامی داوەتەوە:" گاندی میللەتی هیندە، ئەگەر ئەو

39- Roandtable Confrance
40- Stanley jones





بانگهێشت بکەن ئەوا هیندستانتان بانگهێشت کردووە و ئەگەر واتان نەکردبێ، بە چاوپۆشی لەوەی چ کەسێکی ترتان بانگهێشت کردووە، ئەوا وا دابنێن گشت هیندستان ئامادە نەبووە. (ئێروین)یش بەکەمێ شەرمەزارییەوە بانگهێشتە شاهانەکەی نارد بۆ ئەو بەشەی بەندیخانە کە گاندی تیا بەند کرابوو.

ئەم جارە هەلومەرج بەتەواوی لەگەڵ ئەوکاتەی کە وەك قوتابییەکی کۆلێژی ماف چوو بوو بۆ لەندەن جیاواز بوو. ئێستا وەك نوێنەری ١/٥ یەك لەسەر پێنجی دانیشتوانی جیهان میوانی تاج و تەختی پاشا بوو. لەگەڵ ئەمەشدا ئەو پێشوازییە گرنگەی کە بۆی ئامادەکرابوو قەبووڵی نەکرد و بەباشی زانی لە(ئیست ئیند)[٤١] کە یەکێ لە هەژارنشینترین گەڕەکەکانی لەندەنە نیشتەجێ ببێت. لەوێ دڵی خەڵکیی، بەتایبەت منداڵانی بۆخۆی راکێشا، هەرچەند بەرنامەی سەفەرەکەی زۆر چڕوپڕ بوو، بەڵام هەموو رۆژێ چەند ساتێ لەگەڵ منداڵاندا خەریکی گاڵتە و گەپ و یاریکردن دەبوو. منداڵان لەکاتی ڕێپێوانی دوور و درێژی رۆژانەیدا، لە دەوروبەری ژێرزەمینەکانی لەندەن لەناو تەمی بەرەبەیاندا رایان دەکرد بەدوایدا و لەکاتێکدا هەوڵیان دەدا لەگەڵ هەنگاوە زلەکانی دەرچن، بەگاڵتەپێکردنەوە هاواریان دەکرد:"هۆو گاندی، شەرواڵەکەت کوانێ؟"

گاندی لەم سەفەرەیدا سەردانکردنی پارێزگای(لانکشایر)[٤٢] ی خستە بەرنامەی کارییەوە. ئەو شوێنەی کە زۆربەی هەرەزۆری کارگەکانی رستن و چنینی ئینگلیستان لەوێ کۆببوونەوە. هیندستان بەپێی یاسایەکی سەپێنراوی داگیرکاری دەبا هەموو بەرهەمی لۆکەی خۆی بەنرخێکی کەم بنێرێ بۆ ئینگلستان. کارگەکانی لانکشایر بەم لۆکەیە قوماشیان بەرهەم دەهێنا و قوماشەکان بەچەندین ئەوەندەی ئەو پارەیەی کە بە جوتیارە هەژارەکانی هیندستان دەدرا بۆ چاندنی، دەفرۆشرایەوە بەخودی خۆیان.

41- East end
42- Lancshire

گاندی داوای لە هەموو هیندییەکان کرد چ فەقیر و چ دەوڵەمەند، کە پیشەی دێرینی-بەدەست چنین- فێربن بۆ ئەوەی خەڵکی ٧٠٠,٠٠٠ حەوتسەد هەزار گوندی هەژارنشین و قات و قڕی لێدراوی هیندستان بتوانن کار و ئازادی و کەرامەتی خۆیان بەدەست بێننەوە؟ هەروەها داوای لە هەموو هیندییەکان کرد کە قوماشە سپی و زبرەکانی بەرهەمی نیشتمانەکەی خۆیان لەبەرکەن کە پێیان دەگوت (خادی)[٤٣] و ئابلۆقە بخەنەسەر قوماشی دەرەکی. قوماشی خادی، بوو بە نموونەی ئازادی و چینی دەوڵەمەند و مامناوەندی کۆمەڵگای هیندستانی بە توێژی هەرە گەورە و هەژاری هیندستانەوە گرێدا. تەنانەت پێشەوا گەورەکانیش وەك(جەواهر لەعل نەهرۆ) بەشێك لە چالاکییەکانی ڕۆژانەی خۆیانیان تایبەتمەند کردبوو بەچنینی خادییەوە. هیچ تاکێکی ئارەزوومەندی سەربەخۆیی هیندی چ دەوڵەمەندو چ هەژار، تەنانەت بە بیرکردنەوەش بیریان لە لەبەرکردنی شتێکی تر نەدەکردەوە جگە لە خادی. لە هەمان کاتدا لایەنگرانی ئیمپراتۆریەت و کەسانێکی وەك(سێر وینستون چەرچڵ)[٤٤] لەتاو توڕەیی لێوی خۆیان دەگەزی، گاندی تەنانەت لەکاتی خواردنەوەی چای لە کۆشکی(بۆکینگهام)[٤٥]، کاتێ میوانی پاشای ئینگلستان بوو(لۆنگ و شاڵ)[٤٦] ی لە دەوری خۆی دەپێچا و کاتژمێرە گیرفانییە بەناوبانگەکەی بەلاکەمەرییەوە شۆڕ دەکردەوە، پاشتر کاتێ پەیامنێرێك پرسیاری لێکرد:" بەڕێز گاندی پێتان وانییە کە ئەو جلوبەرگەی جەنابت بۆ وەهاکاتێ کەمێ ناموناسیب بێت؟" گاندی لە وەڵام دا گوتی:" خاوەن شکۆ بەقەت هەردووکمان جلوبەرگی لەبەرکردبوو."

43- Khadi
44- Sir Winston charchill
45- Buckinghom

٤٦- ئەو پارچە قوماشە سپییە درێژەی لە خۆی دەپێچا.





سەرەنجام کارگەکانی لانکشایر داخستنی خۆیانیان ڕاگەیاند. هەزاران کرێکاری ئینگلیزی بێکار بوون و لانکشایر پڕ بوو لە کرێکارانی بێکار کە بە توڕەیی و غەزەبەوە گاندییان بە هۆکاری دروست بوونی وەها بارودۆخێك دەزانی. بەڵام ئەو دەیزانی کە کرێکارانی ئینگلیزی و هیندی لە ئەگەری فەراهەم بوونی هەلومەرجدا توانای تێگەیشتن و دەرك پێکردنی هەستی یەکتریان هەیە. هەرچەندە کە حکومەتی ئینگلیز نیگەرانی پاراستنی گیانی گاندی بوو، بەڵام ناوبراو بۆ بەرگریکردن لە ئامانجەکانی گەلەکەی چوو بۆ لانکشایر.



**لە لانکشایر، ساڵی١٩٣١**

جەماوەرێکی هەرە زۆر لە کرێکاران کە زۆربەیان گاندییان بە تاوانباری بێکاربوونی خۆیان دەزانی، بۆ دیتنی ئەم پیاوە کۆبوونەوە. گاندی بە ئارامی وتی: "زەحمەت نەبێ تەنیا چەند خولەکێك گوێ بۆ وتەکانی من ڕادێرن، ماوەم بدەن بۆ

ئەوەی دیدگاکانم دەربڕم. پاشان ئەگەر ویستتان، خۆم و گەلەکەشم تاوانبار بکەن. ئێوە دەڵێن کە لێرە سێ مانگە سێ ملیۆن کرێکار بێکاربوونە، لە ولاتەکەی مندا سێ ملیۆن نەفەر هیچ نەبێ لە ساڵێکدا شەش مانگ بێکارن. ئێوە دەڵێن چەندین ڕۆژە جگە لەنان و پەنیر هیچی ترمان نییە بۆ خواردن، بەڵام ئەو خەڵکەی کە من باسی لێوە دەکەم، زۆربەی ڕۆژەکان بەرێ دەکەن بێ ئەوەی هیچیان خواردبێ."
لەکۆتایی وتەکانی گاندیدا، کرێکاران چەپڵەیان بۆ لێدا بۆ هەمان ئەو پیاوەی کە ببووە هۆی بێکارییان.

"*[ساتیاگراها] وزەیەکە کە وا بەدیار دەکەوێ بێدەنگ و لەسەرخۆ کاریگەریی دەبێت، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ هێزێك لە جیهاندا نییە کە وەها راستەوخۆ و خێرا کاریگەر بێت.*



**لەگەڵ کرێکارانی(تاش) لە لانکشایر**

*"ناتوندوتیژی و ترس پێکەوە کۆ نابنەوە، دەتوانین پیاوێك بێنینە پێش چاومان کە تەواو پڕ چەکە بەڵام لە دڵدا ترسنۆکە، هەبوونی چەك بەواتای هەبوونی هەندێ دەماری ترسە لە مرۆڤدا- گەر نەڵێین بێ غیرەت و ترسنۆك-. بەڵام ناتوندوتیژی راستەقینە بەبێ بوونی بێباکییەکی بێگەرد، لە ڕۆحی تاکدا نایەتە دی."*





گاندی بەردەوام دەیگوت دەستهەڵگرتن لە توندوتیژی بۆ خەڵکی بەهێز سەخت نییە. بێ هێزەکانن کە وەها کارێ بە ئاستەم دەزانن؟ چونکە توندوتیژی ئەنجامنەدان واتە خۆش ویستنی ئەو کەسانەی کە قینیان لە ئێمە دەبێتەوە و دەربڕینی هاوخەمی لەگەڵ دڵگەورەیی لەبەرامبەر قیناوی تریی دوژمناندا. ئەمە سەختترین وانەیە کە تاك دەتوانێ لەژیاندا فێری بێت. بۆیە بهاگاوادگیتا دەڵێ: گەر دەتانەوێ ئازاکان بدۆزنەوە، بگەڕێن بەدوای ئەو کەسانەدا کە توانای بەخشینیان هەیە و ئەگەریش دەتانەوێ کەسانی قارەمان بدۆزنەوە، بگەڕێن بەدووی ئەوکەسانەدا کە لە توانایاندا هەیە لەبەرامبەر نەفرەتدا، ئەوین و خۆشەویستی دەربڕن.

وەها گۆڕانێکی دەروونی لە پارێزگایەکی سنووریی باکووری ڕۆژاوای هیندستان، لەنێوان چیا بلند و بەردینەکاندا لەپاڵ گەرووی(خەیبەر)دا بە تەواوی ئاشکرا و دیار بوو. لەم ناوچەیەدا رابەرێکی گەورە سەری هەڵدا کە لای خەڵك بە"گاندیی سنووریی" ناوبانگی دەرکرد. ئەم کەسایەتییە"خان عەبدولغەفار خان"بوو؟ لە کۆمەڵگایەکدا سەری هەڵدابوو کە یاساکەی بریتی بوو لە"چاو بەرامبەر چاو و دان بەرامبەر دان". گەلەکەی(پاتان[٤٧])ەکان خەڵکێکی بێ باك و شەڕکەرێکی بەجەرگ بوون کە ئەوینی ئازادی ئاگری لەناخیاندا هەڵگیرساندبوو. هەرچەندەش سەربازە ئینگلیزەکان دەستیان بەسەرپارێزگاکەدا گرتبوو، بەڵام هێشتاکە چوونە نێو چەندەها دۆڵ لە چیاکاندا بۆ ئینگلیزەکان بە پڕمەترسی وەدیار دەکەوت، کاتێ گاندی بڕیاریدا کە بڕوات بۆ سنووره باکورییەکان، هەموو گەلی هیند نیگەرانی سەلامەتی گاندی بوون هەڤالانی گوتیان:"ئەمانە خەڵکانێکی توندوتیژن، سەردانکردنیان چی لێ بەدەست دێ؟ تەنیا شتێ کە دەیزانن جەنگە."

گاندی وەڵامی دانەوە:"منیش شەڕکەرم، دەمەوێ فێریان کەم کە چۆن بێ توندوتیژی و بێ ترس بجەنگن."

کۆمەڵێ لە پاتانەکان چەك لە شان بەسەرسامییەوە لە دەوری ئەم جەستە بچکۆلەیە بەو پارچە قوماشەی کە لە دەوری خۆی دەپێچا کۆبوونەوە بۆ ئەوەی بزانن چی دەڵێ. بە نەرمی

47- pathans

پرسیاری لێکردن:"ئایا دەترسن؟ ئەگەر ناترسن ئەی بۆچی چەك هەڵدەگرن؟" پاتانەکان مات و سەرسوڕماو تەنیا سەرنجیان دەدا. تا ئێستا کەس نەیوێرابوو بەم جۆرە قسەیان لەگەڵدا بکات. گاندی درێژەی بە وتەکانیدا:"من هیچ ترسێکم لەدڵدا نییە، هەر بەم هۆیەوە چەکدار نیم؟ ئەهیمساش واتە ئەمە." عەبدولغەفارخان چەکەکەی خۆی فڕێ دایە لاوە، پاتانەکانیش بە پەیڕەویکردن لەڕابەرەکەیان بوونە کۆمەڵێك لە ئازاترین پەیڕەوانی ڕێگای عەشق؟ ئەو ڕێگای ئەوینەی کە گاندی خستبوویە بەردەمیان.



**لەگەڵ خان عەبدولغەفارخان**

*"ڕێبازی ناتوندوتیژیی من، -وزە-هێزێکی لەڕادەبەدەر کاریگەرە. جێگای ترس یاخود بێ توانایی تیانابێتەوە. مرۆڤ دەتوانێ هیوادار بێ کە کەسێکی توندڕەو ڕۆژێ دەست لە توندوتیژی هەڵدەگرێ، بەڵام وەها هیوایەك لە بۆ ترسنۆك لە ئارادا نییە.*

*"هێز لە توانای جەستەییەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو لە ئیرادەیەکی تۆکمە و مەحکەمەوە هەڵدەقوڵێ."*





*"گرنگ نییە کە هەر ناوێکی لێ بنێیت. ئەو کەسێکە کە زۆرترین ئارامی لەناو بەگوڕترین بڵێسەکاندا بەمرۆڤ دەبەخشێت، ئەو،"خودا"یە."*

ئینجیل دەڵێت: "ئەوینی تەواو و بێ خەوش، ترس لەناو دەبا." ئەهیمسا ئەوینی تەواو و بێ خەوشە و لەسەروو هەستگەرایی ڕەهاوەیە، ئەهیمسا کاروکاردانەوەیەکە کە لە هەموو تەمەنی مرۆڤدا لەناخیدا بەردەوامە؟ بەرەنگاری و جیهادێکی وەها سەختە کە هەرکەسێ لەژێر فەرمانی هەر ئایینێکدا هەنگاوی لە ڕێگەی ئەویندا هاویشتبێت، بە- تیژتر لە دەمی تیغ ناوی هێناوە، گاندی ئەم بابەتەی پاك و بێ پەردەشیکردۆتەوە:"تەنیا کاتێ دەتوانن بانگەشەی ئەوینداری بکەن کە خۆشیی خەڵکی ترتان لەخۆشیی خۆتان بەلاوە گرنگتر بێت و تەنانەت ژیانی خەڵکی دی لە ژیانی خۆتان بە گرنگتر لەقەڵەم بدەن. هەر بارودۆخێکی تر هیچ نییە جگە لەبازرگانی و مامەڵەکردن، فراوانکردنی پانتایی ئەم عەشقە تەنانەت بەرامبەر بەوانەش کە رقیان لێتان دەبێتەوە ئەوپەڕی پلەی ئەهیمسایە و ئەمەش شتێکە کە ئێوە بەرەو سنوورەکانی هۆشیاری ڕاپێچ دەکا."



**شێوازی سڵاوکردنی کولتوریی هیندۆسەکان. هەر بەم شێوەیەش دۆعای بۆ بکوژەکەی خۆی کرد**

گاندی خۆی لە سەرقافڵەی ئەم دەسەڵاتە هۆشیارییەدا بوو. هەڵسان بە هەرکارێ لەلایەن ئەوەوە، ئەزموونێك بوو بۆ، هەرچی زیاتر پانتایی بەخشین بە لێهاتوویی ئەویندارییی مرۆڤ، بەگەشەسەندنی لێهاتووییەکانی، خواستی گاندی بۆ گەیشتن بە عەشق توندتر و توندتر دەبوو؟ دەتوت ئەوپەڕی ئەو پانتاییەی کە مرۆڤەکان دەتوانن پێی بگەن تاقی دەکاتەوە، بەڵام گاندی فێر ببوو کە چۆن لەنێو تۆفان و هەوڵەکاندا خۆشی و چێژێکی قووڵ بدۆزێتەوە، چەندین و چەندین جار ئەو کاتەی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ توندوتیژی بە شتێکی نەکراو دەهاتە پێش چاو، بەبێ گرنگیدان بە ئاسایش و خۆشیی خودی خۆی، خۆی خستە نێو کێشمەکێشەکانەوە، هەرجارێ کە وەهای دەکرد، لە دواساتەکاندا وزەیەکی قووڵتر لەوەی پێشتر ناخی دەگرتەوە و پڕی دەکرد لە وزە و خۆشەویستی. عەشق تا دواساتەکانی تەمەنی،





دەروونی روناك دەکردەوە، وەك ئاگرێ کە شەو و ڕۆژ هیچ شتێ نایکوژێنێتەوە بڵێسەی تێدا دەسەند، بڵێسەیەك کە هەموو ئارەزو و خواستێکی نێو دەروون دەسووتێنێ و لەناوی دەبا. ئەو گێرمە و کێشانەی کە گاندی تا دوایین ساتەکانی ژیانی لەگەڵێدا ڕووبەڕوو بوویەوە، لە گەورەترین ئەو تراژیدیایانەیە کە مێژوو بە خۆیەوە بینیویەتی. لە شەوی سەربەخۆییدا، هیندستان گۆڕەپانی شەڕە قورسەکانی نێوان موسڵمانان و هیندۆسەکان بوو. هێزەکانی حکومەت بێ توانا بوون بۆ وەستاندنی ئەو بەکۆمەڵکوژییانەی کە هەموو ڕۆژێ لەلایەن هەردوو لایەنەوە ڕوویدەدا. گاندی بەهۆی ژیان لەگەڵ بڕوای برابوونی هەموو ئایینەکان، رق و کینەی هەموو هیندۆس و موسڵمانەکانی ڕووبەڕووی خۆی کردبوویەوە.



**سەردانکردنی ماڵێك لە ویلایەتی بیهار، کە بە هۆی ئاژاوەکانەوە وێران بووە**

خوێن ڕشتن و وێرانکاری لە ناخەوە ڕۆحی گاندی ڕەنجاندبوو. لەگەڵ ئەوەدا کە لە دەوروبەری تەمەنی حەفتا ٧٠ساڵیدا بوو توندوتیژی بەرامبەر دڵی خۆی بەکارهێنا و چوو بۆ دێهاتە دووردەستە تاڵانکراوەکانی ناوچەی(بیهار ونواخالی)[٤٨] لەکاتێکدا کە تەنانەت بۆ خۆراکی خۆیشی پێویستی بە بەزەیی دوژمنەکانی بوو، وەك هێزێکی تاکەکەسی ئاشتی پارێز بەپێی پەتی چەندین ناوچەی هیندستانی بڕی و هەندێك لە پەیڕەوانی ئەوانەی کە باوەڕپێکراوترین یاوەرانی بوون و لە مەیدانەکانی تر تاقی کرابوونەوە و ئەوین و شەهامەتی خۆیان لە دەس نەدابوو، ناردنی بۆ گوندەکانی تر تاکو وەك خۆی بە کارەکەی ئەو هەستن.



**تێپەڕین بە گوندێکدا لە بیهار لەکاتی ئاژاوەکاندا. خان عەبدولغەفارخان هاوڕێیەتی دەکات**

48- Bihar stat and noakhali





ئەوان پەیڕەو و دەستورێکیان پێ نەبوو کە کاری پێ بکەن جگە لە ژیان لەگەڵ ئەو ڕاستییانەدا کە ئێستا بۆ ئەوەی خەڵکی لەسەر ڕابهێنن بەرەو ئەوێ وەڕێ کەوتبوون: عەشق و ڕێزگرتن لە هەموو مرۆڤێ و بڕوای ڕەها بە خود و بێباکی، کە سەرچاوەکەی ئەهیمسا بوو.

*"ئەو کەسەی کە بەدیتنی کێشمەکێشی نێوان دوو کەس دەلەرزێ یاخود لە- لەناوچوون رادەکا، نەك تەنیا ئەوەی کە هیچ لە ناتوندوتیژی نازانێ بەڵکو ترسنۆکە، ئەو کەسەی کە ئایینەکەی پەیڕەویکردنە لە ناتوندوتیژی، گیانی خۆی لەپێناو پێشگیریکردن لەم کێشمەکێشە دەسپێرێ."*



**گاندی لە ویلایەتی نواخالی**

*"ئەو هێزەی سەرچاوەی لە ژمارەی کەسەکانەوە گرتبێت، مایەی خۆشحاڵی ترسنۆکەکانە. ئەو کەسەی کە بە ڕۆح ئازایە جگە لە خەبات چێژ لە هیچ وەرناگرێ."*

ئەم هەوڵە بۆ گاندی سەنگی مەحەکی ئەهیمسا بوو، هەموو بوونی لە ئارەزووی گەیشتن بە خواستی خۆی دەسوتا. ڕۆژانە١٦ تا ٢٠ کاتژمێر ڕێگەی بەپێ دەبڕی، کاری دەکرد و دەینووسی. هەنگاوی دەنایە هەر شوێنێ، کەسایەتییەکەی، ئەو بەربەستانەی هەڵدەگرت کە بەهۆی نەریتە ئایینییەکان و کۆنەپەرستی و نەبوونی متمانە لەنێو خەڵکدا هەبوون. لە هەر گوندێکدا کردارێکی سەرسوڕهێنەری بچووك ڕووی دەدا: خێزانە موسڵمانەکان گیانیان دەخستەسەر لەپی دەستیان و ڕێگەیان دەدایە گاندی بچێتە ماڵەکانیانەوە، پیاوکوژان و شڕەخۆرەکان دەهاتن و چەکەکانیان پێ دەسپارد و ئەوەی کە تاڵانیان کردبوو دەیانگەڕاندەوە بۆ ئەو یاخود بۆ قەرەبووی زیانی ئەوانەی کە ماڵیان تاڵانکرابوو پارەیان دەدایە. دەگێڕنەوە لە یەکێ لە گوندەکاندا ئاژاوەگێڕێ کە بە وەحشیگەری ناوبانگی دەرکردبوو هاتە لایەوە و لە بەرامبەر سەدان نەفەر کە هەناسەیان بەندببوو و سەیری ڕووداوەکەیان دەکرد، هەردوو دەستی ئاڵاندە ملە لاوازەکەی گاندی و بەمەبەستی خنکاندنی زۆری بۆ هێنا.







**لەکاتی یارمەتیدانی(ئیمتۆس سەلام)ی قوتابییە موسڵمانەکەی، بۆ شکاندنی ڕۆژوو-ە سەرکەوتووانە کەی کە ٢٥ڕۆژ درێژەی کێشا و لەپێناو هێنانە کایەی یەکگرتوویی نێوان هیندۆس و موسڵمانەکان لە گوندێك لە ویلایەتی نواخالی؟ کە گاندی بەتەنیا بۆ ئەوێی ناردبوو.**

ڕۆحی گاندی گەیشتبووە پلەیەك لە گەورەیی کە تەنانەت بچووکترین نیشانەی ڕق و دوژمنایەتی لە ڕوخساریدا بەدەر نەکەوت، تەنانەت وشەیەکیشی بە مەبەستی ناڕەزایی دەربڕین بەسەر زاردا نەهێنا. خۆیی بەتەواوی سپاردبووە دەستی جۆش و خرۆشی ئەوینی دەروونی. پاش چەند ساتێکی کەم ئیرادەی پیاوەکە تێکشکا، کەوت بەسەر قاچی گاندیدا وەك منداڵێ کەوتە گریان و هەنسکدان.



**ویلایەتی بیهار، ئافرەتێکی موسڵمان کە، ماڵ و داراییەکەی بە دەستی دز و ڕێگرەکان تالآن کراوە، داوای یارمەتی لەگاندی دەکات.**

بۆ ئامادەبووان ئەمە ڕووداوێکی سەرسوڕهێنەر بوو، بەڵام بۆ گاندی کە لەگەڵ دڵگەورەیی و خۆشەویستی جەماوەردا ڕاهاتبوو شتێك نەبوو، جگە لە سەدمین جار سەلماندنی قوڵایی وتەکانی(بودا) کە دەڵێت:"هیچ کاتێ ناتوانرێ ڕق بە ڕق لە ناوببردرێ، ڕق بەخۆشەویستی لەناو دەچێ، ئەمە یاسایەکە گۆڕان هەڵناگرێت."





*"بڕوا-ئیمان تەنها دەربڕین نییە بەزمان، بەڵکو جۆرێکە لە بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ مەرگدا.*

*"دەکرێت جۆرەکانی سیاسەت بگۆردرێن و زۆربەی کاتیش وەها دەکەن، بەڵام نەبوونی توندوتیژی ئایینێکە کە گۆرانکاری بەسەردا نایەت، دەبێ لەو کاتەدا بەکاری بهێنن کە توندوتیژی بە دەورتانەوە هەرا دەکات.*

*"پەنابردنە بەر ئەو شێوازانەی کە توندوتیژی تیا نییە لە بەرامبەر کەسێکدا کە خۆیشی توندوتیژی بەکار ناهێنێ هیچ بەهایەکی نییە. لەوانەیە هەر لەبنچینەدا نەتوانرێ وەها کارێ ناوی لێبنرێ ئەنجامنەدانی توندوتیژی؟ کاتێ کە لەبەرامبەر توندوتیژیدا پەنا ببەینە بەر ناتوندوتیژی، پەی بەم جیاوازییە دەبەین. کارێکی لەم جۆرە بە هۆشیاری و هەوڵدانی هەمیشەیی نەبێت بەدی نایەت.*

*"ئایا ئەو ناتوندوتیژییەی کە شایستەی ئازاکانە لە خۆمدا دەبینم؟ تەنها مەرگ دەتوانێ وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە. ئەگەر کەسێ من بکوژێ و من لە حاڵەتێکدا بمرم کە دەمم بۆ بکوژەکەم بپاڕێتەوە و یادی خودا بکات و ئاگابوون لە ئامادەبوونی هەمیشەیی زیندویی ئەو(خودا)، پەرستگای دڵمی تەنیبێت، تەنها لەم بارەدایە کە دەتوانم بڵێم ناتوندتیژیی ئازاکانم هەبووە."*



**لە ویلایەتی بیهار**







**ڕێپێوانی بەرەبەیان، لەکاتی سەفەرەکانی بۆ چەسپاندنی ئاشتی لە بیهار. عەبدولغەفارخان لەگەڵیەتی.**

*"بەردەوام ئامانج لێمان دوور دەکەوێتەوە، هەر چەند پێشکەوتنی مەزنتر وەدەست بهێنین پتر پەی بە بێ بەهایی خۆمان دەبەین. ئەنجامی هەوڵدان شادییە، نەك وەدەستهێنانی ئامانج. هەوڵی تەواو و دروست خودی سەرکەوتنە."*

# دایك و منداڵ

چالاکانی بواری رامیاری وخاوەن راوبۆچوونەکان، بەوردی لەو شتەیان کۆڵیوەتـەوە کە ناوی لێدەنێن"سیاسەتی گاندی" و"ئابووری گاندی". بەڵام ئەو کەسانەی کە ئـەو کێشانەیان دەربڕیوە کە بەڕاستی شایانی گرنگـی پێـدانن لەمـەر گانـدی، بـە پەنجـەی دەست دەژمێردرێن. کێشە یاخود بابەتێکی وەك ئەوەی کە، ئەو چـۆن وەهـا کـارێکی کرد؟ ئەو هێـز-وزە-ی خـۆیی لـەکوێوە هێنـا؟ چـۆن وەهـا پیـاوێکی وردیلانـە و زۆر ئاسایی و ئەو پارێزەرەی کە هیچکات فایلێکی یاسایی پێ نەسپێردرا، توانی ببێ بـە کەسێ کـە لـە بەرامبـەر گـەورەترین ئیمپراتۆرییـەتی جیهانـدا راوەسـتێ و پەنجـە لـە پەنجەی گیر کات و بەبێ ئەوەی تەنانەت یەك فیشەك بتەقێ براوەی مەیدان دەرچێ؟

رۆژنامەنووسێکی ئەمریکی کە چەندین ساڵ بەوپـەڕی رێـزەوە بـەدووی کارەکـانی گاندییـەوە بـوو، سـەرئەنجام رۆژێ وەکـو رەوشـتێکی کـورتکراوە خـوازی تایبـەت بـە رۆژنامەنووسان لـە گانـدی پرسـی:"دەتوانیـت نهێنیـی ژیـانی خـۆت لـە سـێ وشـەدا دەربڕی؟"

گاندی کە هیچکات توانای بێ وەڵام هێشتنەوەی هیچ پرسـیارێکی نـەبوو، بـەدەم زەردەخەنەیەکی زیرەکانەوە وەڵامی دایەوە:"چاوپۆشی و چێژ."[٤٩]

وەڵامە کەی گاندی وتەیـەك بـوو لـە(ئیشائۆپانیـشاد)[٥٠] -یـەکێك لـە کـۆنترین نووسراوە کانی هیندۆس-ی. لە چاوی ئەودا هەموو بهاگاواد گیتا هیچ نەبوو جگە لە روونکردنەوەی ئەم وشە ساکارانە، ئەو وشانەی کە توانیویانە سەرکەونە سەر بڵندترین

49- Renouce and eniog
50- isha upanihad





لوتکەی زانستی مرۆڤایەتی. گاندی دەڵێ: گـەر خوازیـاری چـێژ وەرگـرتنین لـە ژیـان، نابێ تەنها لەبەر خودی خۆمان پەیوەست بین بە شتێکەوە، نە پارە و نـە دارایـی و نـە هێز و نە کەسایەتی و نە خێزان و نە دۆستان. هەرهێندەی کە لەبەر خۆمان پەیوەست بین پێیانەوە بووینەتە بەندە و دیلیان.

"*مەبەستی من لە چاوپۆشی ئەمەیـە کـە مادامـەکی مورادتـان پـاك و رێگـەتان دروستە نـابێ نیگـەرانی گەیـشتن یـا نەگەیـشتن بـە ئامـانجی خـوازراوی خۆمـان بـین. لەراستیدا گەر لە رێگە راستییەکان دەرنەچین، هەموو شـتێ بـسپێرن بـە''ئـەو''، لـە کۆتایی کاردا ئەنجامە خوازراوەکان خۆیان بەرەو پیری ئێوەوە دێن.*"

لە زمانی بهاگاوادگیتادا چاوپۆشی واتە''لێهاتوویی لە کاردا''. ئـەو کەسـەی کـە نیگەرانی ئەنجامی کارەکەیەتی، ئامانج یا خود مەبەسـت نـابینێ و تـەنها دوژمـن و بەربەرستەکان دێنە پێش چاوی. تاکێکی لەو جۆرە لەکاتی هەستکردن بە بێهێـزی لـە بەرامبـەر گرفتەکانیـدا دڵـسارد دەبـێ و بەنائومێـدی و دابڕانـەوە پـەنا دەباتـە بـەر توندوتیژی. بەڵام ئەو کەسەی کە لە بیرکردنەوە لە ئەنجامەکانی کارەکەی رزگار بووە، هەموو هەوڵی خۆی دەخاتەگەڕ بەبێ بیر و خـەیاڵی سـوود یـا زیـان و وەدەسـتهێنانی هێـز و کەسـایەتی، لـە کـاتی بەرەنگاربوونـەوە لەگـەڵ گرفتـەکان، لەبەرامبەریانـدا ناڵەرزێ. ئەو رێگاکەی خۆی لە پـشت هـەر کۆشـشێکەوە کـە بەئـەنجامی دەگـەیێنێت بەروونی دەبینێ. چونکە هەمیشە چاوی لە ئامانجە.

چاوپۆشی نە دڵمردن و نە گرنگـی پێنەدانـە، بـەڵکو پێویـستیی رووبەڕووبونـەوەی پێـشوەختی چـالاکانەیە لەگـەڵ کێـشەکاندا. زۆربـەی کـات پەیوەسـتبوونمان بـە بیروبڕواکانمانەوە، دەبێتە هۆی ئـەوەی ئەوشـتەی کـە بـە بۆچـوونی ئێمـە بـۆ خـەڵکی باشترین کارە پێچەوانەوە دەرکەوێت، چونکە حەز دەکەین خەڵکی بـەو شـێوەیەی کـە ئێمە دەمانـەوێ خۆشـحاڵ بێـت. تـەنها کـاتێ شـتێکمان بـۆ خـودی خۆمـان نـەوێت دەتوانین ویستی خەڵکانی دی بەروونی ببینین و رێگەی خزمەتکردنیان بدۆزینەوە.

کاتێ گاندی وەشوێن کارە تايبەتييەکانی خۆی کەوتبوو، هيچکات نەيتوانی ئەو کانگا مەزنەی بەهرەمەندی بەدەست بێنێ کە لەدەروونيدا شاراوە بوو. تەنها کاتێ کە بۆ خەڵك دەستی بە ژيان کرد، هەستی کرد کە خاوەنی هێزێکی کۆنترۆڵ نەکراوە. تا گەيشتن بە تەمەنی دەوروبەری حەفتاساڵی توانای چالاکييەکانی ببووە چەندين ئەوەندەی ئەو هێزەی کە لە تەمەنی بيست ساڵيدا هەيبوو و لەسەردەمی قەيرانە سەختەکاندا کە بەقوڵتربوونەوەی بەخشيش و وازهێنان لەمافەکانی خۆی زيادی دەکرد و چەندين کانگای دەوڵەمەندتری وزە و سەبری بەدەست هێنا. بەدرێژای کۆنفرانسی مێزگرد هەموو شەوێ کاتژمێر١١ دەچووە سەرجێی نووستن و کاتژمێر٢ی بەرەبەيان لە خەو هەڵدەسا. لە دەوروبەری حەفتاوحەوت ساڵی و لە کاتی ئاژاوەگێڕييەکانی هيندۆس و موسڵمانەکان و لەکاتی سەفەرەکانيشی بۆ ناوچەی نواخالی و بيهار، هەمان ئەم بەرنامەيەی پيادە دەکرد. بەڵام لەو سۆنگەيەوە کە فێر ببوو قەت رێگە نەدا نيگەرانيی شکست يا سەرکەوتن پێ بنێتە نێودڵی، دەيتوانی بەبێ لە کۆڵگرتنی باری ئاڵۆزی راڕايی و ماندوويی، هەموو هزر و بۆچوونی بخاتە سەر ئەو کارەی کە لە پێشيەتی.

جارێکيان رۆژنامەنووسێکی رۆژئاوايی لێی پرسی:" بەرێز گاندی ماوەی٥٠ساڵێك دەبێ کە رۆژانە دەوروبەری پانزە کاتژمێر جەنابت کار دەکەی، پێتان وانييە کە ئيتر کاتی ئەوە هاتووە پشوويەك بەخۆتان بدەن؟"

گاندی لەوەڵاميدا گوتی:"من هەميشە لە پشوودام."

ئەمە بهاگاوادگيتايە کە بە روناکترين ديمەنەوە هونەری بەئازادی ژيانمان فێر دەکات. گانديش هەرچۆن بێت رۆڵەی گيتايە. هەرچەند بەوردی بڕوانينە بەرهەمەکانی ئەو لە بواری رامياری و ئابووری و بەرەنگاری ناتوندوتيژی، ناتوانين پەی بەسەرچاوەی هێزی گاندی بەرين. بەڵام ئەو خۆی بەساکارييەکی منداڵانەوە بە ئێمە دەڵێ:

*"گيتا، لەساڵی١٨٨٩وە، کە بۆ يەکەمجار پێی ئاشنا بووم، تا بە ئێستا دايکی من بووە. هەميشە لەکاتی رووبەڕووبوونەوەی هەر گرفتێك، بۆ رێنوێنی پەنام وەبەر*

*گیتا بردووە و هەموو کاتێکێش هەر شتێکم ویستبێت تیایدا دۆزیومەتەوە. ئەگەر کەسێ بیەوێ لە پەرسیاری و ئاگاداری ''دایەگیتا'' بەهرەمەند بێت، دەبێ بەوپەری رێز و بە پیرۆزیی روانینەوە، لێی نزیك بێتەوە. ئەو کەسەی سەرنجاتە سەر ئەژنۆ ئارامبەخشەکانی، هیچکات هەست بە نائومێدی ناکات لەخۆیدا و دەبێتە خاوەنی ئەوپەڕی خۆشەبەختی. ئەم دایکە رۆحانییە، زانست و ئومێد و هێزێکی نوێ دەبەخشێتە سات بەساتەکانی ژیانی ئەو کەسەی کە خۆی سپاردۆتە دەستی وی."*

وەرگێڕانی گیتا و خستنییە ناو قالّبی زمانێکی تر شتێکە و بەکارهێنانی لە قالّبی ژیانی رۆژانەدا شتێکی ترە؟ شتێکی تەواو جیاواز. یەکەمیان گەر بێتو چاوپۆشی لەوە بکەین کە پێویستی بەچەندە توانا و زانست بێت ئەمە یاری و راهێنانێکی فیکرییە. بەلاّم دووەمیان دەست دەخاتە نێو قولّترین توێژەکانی ئاگایی مرۆڤ و دەبێتە هۆی گۆڕانێکی تەواو رێکوپێك لە کەسایەتی و ئاکاردا.

گەر بتوانرێ وەك پەرتوکێکی رێنوێنیکەری ژیان لە و مەبەست و بابەتانەی کە لە بهاگاوادگیتادایە بگەی، دەتوانرێت پەی بەکەسایەتی گاندی ببرێت. بەلاّم تێگەیشتن لە بابەتەکانی گیتا بەم شێوەیە، بەبێ هەولّدان و خستنییە نێو قالّبی کار، بەو شێوەیەی کە گاندی ئەنجامیدا ئەستەمە.

*"خۆش ویستنی ئەوانەی کە ئێمەیان خۆش دەوێ ناتوندوتیژی نییە. ناتوندوتیژی واتە ئەو کەسانەمان خۆش بوێت کە رقیان لێمان دەبێتەوە. خۆم دەزانم کە پەیڕەویکردن لەم یاسا مەزنەی ئەوین تا چ ئەندازەیەك سەختە. بەلاّم ئەی مەگەر ئەنجامدانی هەموو کارە گەورە و بە بەهاکان سەخت نییە؟ خۆشەویستی ئەو کەسەی کە رقی لە ئێمە دەبێتەوە، سەخترین کارە، بەلاّم بە لوتف و میهرەبانی خودا، ئەگەر لە سەر جێبەجێکردنیان سوور بین، تەنانەت ئەم سەخترین کارانەش سادە و ساکار دەبێت.*







**لەگەلّ موحەمەد عەلی جناح، رێبەری-موسلیم لیگ-کە دەگوترا دژایەتی هەر رێگە چارەیەکی دەکرد کە گاندی دەیخستە روو**



**لەگەلّ جناح لە بۆمبای، سالّی١٩٤٤**

*"من لە نێوان-ئامۆژگاریی سەرچیا "[٥١] و بهاگاواد گیتادا هیچ جیاوازییەك بەدی ناکەم. ئەوەی کە ئەم ئامۆژگارییە بە شێوەیەکی دوور و درێژ باسی لێوە دەکات، بهاگاواد گیتا لە شێوەیەکی زانستیدا دەیگونجێنێ. لە وانەیە گیتا پەرتوکێکی زانستی نەبێت بەواتای زاراوەیی، بەڵام یاسای عەشق، -یا ئەوەی من ناوی لێدەنێم یاسای خۆبەدەستەوەدان و دەست لەخۆبەردان- لە فۆرمێکی زانستی و سەلمێندراودا، خستۆتەڕوو."*



**لەشەمەندەنەفەردا**

٥١-کۆمەڵێك کاری فێرکارییە لەبواری ئایینی و وتارە ئەخلاقییەکانی عیسا مەسیح، کە تیایدا شوێنکەوتوانیی بەرەو ئەوین و خۆشەویستی بانگهێشت دەکا، تەنانەت بەرامبەر دوژمنەکانیشیان.





*"گیتا دەڵێ: ئەو کارەی کە دەبێ ئەنجامی بدەی ئەنجامی بدە، بەڵام چاوپۆشی لە ئەنجامەکەی بکە، خۆت لە بازنەی ئەنجامەکان دەرباز بکە و کار بکە و شەیدای پاداشت مەبە و بەردەوامی بەکارەکەت بدە.*

"ڕێگەی فێرکاری(دیکترین)ی *تەواو روناك و بێپەردەی گیتا، هەر ئەمەیە. ئەو کەسەی کە دەست لە کارکردن دەشوا دەکەوێت، ئەوەش کە تەنها دەست لە پاداش دەشوا سەردەکەوێ. بەڵام چاوپۆشی لە بەرهەمەکانی کار بەهیچ شێوەیەك بەواتای گرنگی نەدان بە ئەنجامی کارەکە نییە. لە کاتی هەر کارێکدا ئەنجامە دەستکەوتووەکان و کەرەستە و پێداویستییەکانی گەیشتن بە ئەنجام، دەبێ بۆ تاك ناسراو بێت. ئەو کەسەی کە بە وەها ئایینێك پڕچەکە و شەیدایی ئەنجامەکان هزری داگیر ناکات و لەگەڵ ئەمەشدا بەوپەڕی بوونییەوە نوقمی ئەنجامدانی ئەو ئەرکەیە کە لەسەر شانییەتی، هەمان ئەو کەسەیە کە دەڵێین لە بەرهەمەکانی کارەکەی چاوپۆشی کردووە.*



## ساڵی ١٩٤٢

*"لایەنگری ڕاستەقینەی گیتا واتای بێ هیوایی نازانێ، پەناگەی نەمریی ئەو، ئەو شادی و ئارامییەیە کە دیاریی دەستی حیکمەتە. بەڵام دوودڵان و ئەوانەی کە بە هۆش و دانایی خۆیان مەغرورن، قەت ئەم ئارامی و خۆشییە لە دڵدا نابیننەوە. وەها هەستێ تەنها شایستەی ئەو کەسانەیە کە لە ڕۆح- دەروونـدا خۆبەزل نـازانن و لەوپەڕی باوەڕدا و بە هزرێکی چەسپاو و یەکپارچەوە لە پێشگای ئەودا ئامادە دەبن."*

''هزر و دڵی هەماهەنگ و یەکپارچە''[٥٢] هەمان ئەو شتەیە کە گیتا بە''یۆگا'' ناوی هێناوە. یۆگا ڕێك بەپێچەوانەی ئەو جەنگە دەروونییە بەردەوامەیە کە زۆربەی کات لە نێوان هزر و هەست و نەست و دەروونی ئێمەدا بوونی هەیە. واتای یۆگا، یەکێتییەکی تەواو و سەرلەنوێیە لەنێوان پارچە پەرش و بڵاوەکانی ئاستەکانی کەسایەتی ئێمە. یۆگا یاسای''یەکبوون''ە!

گاندی بەدرێژایی کۆنفرانسی مێزگردی لەندەن، لە هەر ساتێ لەو کاتانەی کە بەخەبەر بوو، لەگەڵ ئامانجی ئازادی هیندستان ژیا و ئەمەش کێشکردنێکی خۆکردە بوو کە، بەخێرایی کاری کردە سەر گەلی ئینگلیزی، چونکە گاندی لەگەڵ پەیامەکەی خۆیدا تێکەڵاو ببوو. هیچکات پێویستی بە ئامادەکردنی یادداشت نەبوو بۆ وتار یاخود ئامادەکردنی بەرنامەکان؟ ئەوەی کە پێی هەڵدەسا هەڵقوڵاوی بڕوای بوو.

لە بۆنەیەکدا بە درێژای کۆنفراسەکە، دوو٢ کاتژمێری تەواو بە ڕەوانبێژییەکی تەواو بە نوێنەرایەتی گەلی هیندستان لە بەرامبەر ئەنجومەنی گەل(عموم)ی بەریتانیا قسەی کرد. لە پاش وتارەکەی، پەیامنێرانی ڕۆژنامەکانی لەندەن بەزەوق و خرۆشەوە لە دەوری سکرتێرەکەی کۆبوونەوەو پرسیاریان لێ کرد:"چۆنە گاندی بێ ئامادەباشی و بێ وەستان و تەنانەت بێ یادداشت بەم جوانییە دەدوێ؟"

52- Undivded Singleness





سکرتێرەکەی''دیسایی''[٥٣] وەڵامی دانەوە:" ئەوشتەی کە گاندی بیری لێ دەکاتەوە، ئەوەیە کەهەستی پێ دەکا و ئەوەی کە دەیڵێ و ئەنجامی دەدا هەرهەمووی یەك شتن. ئەو پێویستی بەیادداشت نییە." پاشان بەدەم زەردەخەنەیەکەوە درێژەی بەقسەکانی دا:" من و تۆ بیر لەشتێ دەکەینەوە، بەڵام هەستمان شتێکی ترە، قسەکردنمان جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو دووانە و ئەو کارەش کە ئەنجامی دەدەین، لەگەڵ هەموویان جیاوازە، کەواتە پێویستمان بەکاغەز و یادداشتە بۆ ئەوەی لە ڕێچکەی وتار و وتەکانمان دەرنەچین."

*"لەکاتی نووسیندا، قەت بیر لەوە ناکەمەوە کە پێشتر وتوومە. مەبەستم پاراستنی سازگاربوونی ڕاوبۆچوون و دەربڕینە پێشینەکانم نییە لەمەڕ بابەتێکی تایبەت، بەڵکو کۆششم بۆ ئەوەیە کە خۆم لەگەڵ ڕاستیدا- بەو شێوەیەی کە ئێستا خۆی نیشانی من دەدا- بگونجێنم. ئاکامیش ئەوە بووە کە لە ڕاستییەکەوە بۆ ڕاستییەکی تر بەرز بوومەتەوە و بەم شێوەیە مێشکی خۆم لە سستی بێ هۆکار پاراستووە؟ بەڵام جگە لە مانەش هەرکاتێ کە ناچار دەبم نوێترین نووسینەکانم لەگەڵ نووسینەکانی پەنجا٥٠ ساڵ لەمەوبەریش بەراوورد بکەم، بۆم دەردەکەوێ کە هیچ ناسازگارییەك لەنێوانیاندا نییە."*

*"ڕۆژگارێك دادێت کە تاك دەبێتە تاکێك ک،ە خۆڕاناگیردرێ لەبەردەمیدا و کاریگەری ئەم کارەی، هەموان دەگرێتەوە، ئەم دۆخە، کاتێك سەر هەڵدەدا کە تاك خودی خۆیی تا سەر ئاستی سفر دابەزاندبێت."*

چەند کەسێ لە ئێمە کە بە پەنجەکانی دەست دەژمێردرێن ژیان بەو جۆرە دەبینن کە لە ڕاستیدا وەهایە. زۆربەمان جیهانی لەمەڕ خۆمان بەو شێوەیە دەبینین کە هەین و دیدمان بۆ خەڵکی لە دەروازەی پەسەند و ناپەسەند و بڕیارە کوێرانەکان و ئارەزوو و سوود و نیگەرانییەکانی خۆمانەوەیە. هەر ئەم دیدە دابەشگەرییەی ئێمەیە کە ژیانمان دەکاتە چەندین بەشی وەك: تاك بەرامبەر تاك، کۆمەڵگە بەرامبەر کۆمەڵگە و نەتەوە بەرامبەر نەتەوە. بە مەبەستی دیتنی ژیان بەو جۆرەی کە هەیە واتە یەکەیەکی شیکارنەکراو، دەبێ

53- Desai

هەموو پەیوەستبوونەكانی خۆمان بۆ هێز و چێژ و ئابڕو و سوودە تایبەتییەكان لە خۆ دوور خەینەوە. گەر وا نەبێت ناتوانین جگە لە روانگەیەكی دیاریكراوی تاكەكەسییەوە بڕوانینە ژیان، كەواتە جیهان نەك بەو شێوەیەی كە هەیە، بەڵكو بەو شێوەیە دەبینین كە خواستەكانمان فۆڕمی دەداتێ.

لە پاش چەندین ساڵ خووگرتن بە وەها روانگەیەكەوە و پاش چەندین هەوڵ و كۆششی یەك لەدوای یەك بۆ دەركردنی چێژە تایبەتییەكانی خۆت، كەم كەم باوەڕ دەكەین كە كەسایەتی راستەقینەی ئێمە ئەمەیە. لەڕاستیدا ئەم كەسایەتییە، دەمامكێكە كە لەیادمان چووە لە سەر روخسارمان لایدەین. لە پشت ئەم دەمامكەدا شكۆ و جوانی خودی راستەقینەمان واتە جەسورییەكی تەواو، شادومانییەكی نەمرانە و ئەوینێكی بێ قەید و بەند شاردراوەتەوە.

كاتێ كە گاندی لە پاش چەندین ساڵ ژیان بۆ خەڵك نەك بۆخۆی، توانی ئەم دەمامكە لابەرێت و خۆی تا نزمترین ئاست دابەزێنێ، بۆی دەركەوت كە ئەو شتەی كە لە كاسایەتی خۆیی دوورخستۆتەوە جگە لە هەستی خۆویستیی و ترس و خۆ لە خەڵك بە چاكترزانین زیاتر هیچی دی نەبووە. بەم شێوەیە ئەو شتەی كە بۆی مایەوە، تەنها بێباكی و ئەوینێ بوو كە بە درێژایی كات شاراوە بووە.

(پاتانجالی) كە فێركەرێكی مدیتەیشن بوو لە هیندی كۆندا نووسیویەتی، لە بەرامبەر كەسێكدا كە هەستی دوژمنایەتی تیا مردووە خەڵكی ناتوانن دوژمنی بن، چونكە ئەو لەگەڵ كەس بەربەرەكانێی نییە، لە بەرامبەر كەسێكدا كە هەستی ترسی تێدا مردووە كەس ناترسێ، چونكە ئەو هەڕەشە لە كەس ناكات؟ ئەمە پێناسەی كورت و زانستی هێزێكە كە ئەهیمسای راستەقینە وەك تیشكێ لە ناخییەوە دەریدەداتە دەرەوە.

"*بۆ ئەو كەسەی كە بیرۆكەی ناتوندوتیژیی لە خۆیدا پەروەردە كردووە، هەموو جیهان بەلایەوە یەك خێزانە. نەترسێكی لە دڵدایە و نەكەسیش لێی دەترسێ*".





شەوێك لە ئیشرامی سواگرامدا سەدان كەس بۆ پاڕانەوەی شەوانە كۆببوونەوە خۆر نزیكە ئاوا بوون بوو، رێك لەوكاتەی كە پاش گەرمای بەتینی رۆژانی هیندستان مارەكان لە حەشارگەكانیان دێنە دەرەوە، خەڵك مارێكی كوبرایان دی كە بەرەو جەماوەرەكە دەهات. هەموو دەزانن كە ماری كوبرا بە خێرایی دەگەزێ و گەستنەكەشی كوشندەیە. لە گوندەكانی هیندستاندا كە یارمەتییە پزیشكییەكان زۆربەی كات بەدەست ناكەون ئەم جۆرە مارانە ترس دەخەنە دڵی مرۆڤەوە، شەپۆلی ترس جەماوەرەكەی داگرتەوە، بە زیاتربوونی ترسەكە ئەم مەترسییەش هەبوو كە نەبا یەكێ بكەوێتە ژێر پێی خەڵكەوە، گاندی بێدەنگ ئیشارەیدا بەخەڵكەكە، نەجوڵێن!

گاندی لەسەر سەكۆكە دانیشتبوو و تەنها "دۆتی" یا لۆنگییەكەی لە بەردابوو. قاچ و دەست و سینگی روت بوو. هەناسەی جەماوەر لە سنگدا قەتیس ببوو، مارە كوبراكە راستەوخۆ بەرەو گاندی چوو، رۆیشت و بەئارامی بە سەر رانیدا سەركەوت!

چەند ساتێكی دوورودرێژ بەبێ دەنگی تێپەڕی؟ كەس نەیدەوێرا نە بجوڵێ نە دەنگی لێوەبێت. بێ شك گاندی لەو ساتەدا "مانترام"[٥٤] ەكەی خۆیی وتۆتەوە: راما،راما،راما[٥٥] دەتوت تەنانەت ترس لە مارە كوبراكەشدا بەتەواوی لە ناوچوو. لەوانەبێ ئەویش بە نۆبەی خۆی بۆی دەركەوتبێ كە لای كەسێكە كە قەت ئازاری پێ نا گەێنێ. ئارام و بێ دەنگ خزایە سەر زەوی و بێ ئەوەی ئازاری كەس بدات لەوێ دوور كەوتەوە.

٥٤- مانترام لە ئایینی بودابیزم و هیندۆییزم، زاراوە یاخود وشەیەكی پیرۆزە بە هێزێكی جادوویییەوە كە تاك لە كاتی مدیتەیشندا، لەدڵدا دەهێڵێتەوە.

٥٥- راما. بەواتای(خودا)یە. وە، ك.



**لەگەڵ منداڵێکی موسوڵمان لە بیهار**

*"هەندێ کات ساکارترینی شتەکان بە قورسترینی کارەکان دێنە پێش چاومان. ئەگەر دڵەکانمان کراوەبوایە، هەرگیز دوچاری هیچ گرفتێك نەدەبووین.*

*"ئاتوندوتیژی سەروکاری لەگەڵ دڵی مرۆڤدایە، لە ڕێگەی هەوڵە عەقڵانییەکانەوە هەرگیز بەدەستی ناهێنین و پێیی ناگەین. هەموو خەڵك باوەریان بە خودا هەیە، هەرچەندە زۆربەیان زانیاری تەواویان لەبارەیەوە نییە. هەموو کەسێ باوەڕی بەخۆی هەیە و ئەگەر ئەم 'خود'ە جارانی بێ کۆتایی بکرێت، ئەنجامەکەی یەکسانە بە(خودا)."*

بێباکی شتێ نەبوو کە گاندی لەگەڵیدا لەدایك بووبێت. تەنانەت لە قۆناغی دواناوەندیشدا زۆر دەترسا، تەنانەت لەو منداڵانەش کە لەخۆیشی زۆر بچووکتر بوون. تەنها لێهاتووییەکی کۆڵنەدەرانەی تازە پشکۆتوو هاوڕێ لەگەڵ حەزو ئارەزویەکی زۆر قوڵ بۆ بەهێزکردنی خۆی لە ناخیدا هەبوو.





یەکەم کەس کە بە هانایەوە هات"رامبها"[56] ی پیرە خزمەتکاری ناو خێزانەکەیان بوو. ئەو بەجۆرە متمانەی دەدایە گاندی:"هیچ گرفتێك لە ئارادا نییە بەوەی کە، دان بەترسی خۆتتدا بنێیت، بەڵام هەرکاتێ شتێك هەرەشەت لێ دەکات لەبری راکردن، بەموحکەمی بوەستە و مانترامی راما، راما، دوابەدوای یەك لە دڵدا بڵێرەوە. ئەم کارە دەتوانێ ترسی تۆ بگۆڕێ بۆ نەترسی."

لەو روانگەوە کە گاندی رامبهای زۆر خۆش دەویست و هۆگری بوو، ئامۆژگارییەکەی ناوبراوی ماوەیەك بەکار هێنا، بەڵام پاش ماوەیەك لەیادی کرد. بۆی هەیە لە هزری لاوی ئەودا کە لە کەشێکی پەروەردەیی رۆژاواییدا نەشونمای کردبوو، وتنەوەی مانترام بە کلێشەیەکی ئامێرئاسای خورافاتی دەهاتە بەرچاو، لەگەڵ ئەمەشدا گاندی لەوە زیرەکتر بوو کە شتێ بێ تاقیکردنەوە قەبوڵ یان رەت بکاتەوە. ئەو تۆوەی کە رامبها لە قوڵاییەکانی هۆشیاری ئەودا چاندبووی بە درێژای قۆناغی منداڵی نەشونمای کرد و سەرئەنجام کاتێ کە زریانی کێشمەکێشمەکانی دەمارگیریی رەگەزپەرستانە لە ئەفریقیای باشوور سەریهەڵدا و ناوچەکەی ئەوی گرتەوە، مانترام دووبارە لە قوڵاییەکانی دەروونییەوە سەری هەڵدایەوە و خۆی نیشاندا. مانترام پێ بەپێ بەتوندوتۆڵ بوونی پایەکانی لە ژیانی گاندیدا، بوو بە گەورەترین پشتیوانی و سەرچاوەی هێزێکی دڵنیا.

*"مانترام دەبێتە گاڵۆکی دەستی مرۆڤ و لە هەر تاقیکردنەوەیەکی قورس دەربازی دەکا...*

*"هەر وتنەوەیەك... واتایەکی نوێی هەیە، هەر وتنەوەیەك، تاك لە خودا نزیك و نزیك تر دەکاتەوە."*

پەیڕەوانی هەموو ئایینەکان هەستیان کردووە کە مانترام فۆرمۆڵێکی رۆحییە کە دەتوانێ خاڵە نەرێنییەکانی کەسایەتی تاك بگۆڕێ بە چەندین خاڵی ئەرێنیی،

56- Rambha

دەتوانیٚ تورِەیی بگۆڕیٚ بە هاودڵی، مەرام خراپی بۆ مەرام چاکی و قین بۆ عەشق بە ئارامکردنەوەی زەین، کەم کەم دەتوانریٚ بیرە پەرش و بڵاو و جیاوازەکانی چینە هەرە قوڵەکانی شعور هەماهەنگ و یەك بخریٚت.

مانترامی گاندی-راما- فۆرمۆڵ-ریٚکاریٚکە بۆ گەیشتن بە شادومانییەکی لەبن نەهاتوو. گاندی لەکاتی پیادەڕەوییە چەند قۆناغەییەکانی رۆژانەیدا، هیٚندە ئەم زاراوەیەی لە دڵدا دووبارە دەکردەوە تا ئەو جیٚگایەی کە ئاوازی مانترام لەگەڵ ئاوازی هەنگاوەکانی و هەناسەدانی یەکی دەگرتەوە(زاناکان بەتازەیی بۆیان دەرکەوتووە کە ئاوازی هەنگاوەکان لەگەڵ میٚشکدا پەیوەندییەکی راستەخۆیان هەیە). کاتیٚ گاندی دەکەوتە بەر مەترسی و ترس یا هەڕەشە و تورِەیی بەوتنەوەی"راما"، سوودی لە هیٚزی نیٚو ئەم هەستانە-احساسات- وەردەگرت و جیٚی شادی و ئاسوودەیی لە قوڵایی میٚشك و دڵی خۆیدا دەکردەوە. بەوتنەوەی"راما، راما" بەشادی و خۆشییەوە خەو دەیبردەوە. بەدریٚژایی چەندین ساڵ کاتیٚ کە مانترام لە قوڵاییەکانی دوودڵی و ترسەکانیدا رۆچوو، شادی لەدەروونیدا ریشەی داکوتا و بەپایداری مایەوە. مانترام بووە شازادەی هزری ئەو و ئیدی هیچ شۆڕشیٚك نەیدەتوانی لەدەرەوە بیلەرزیٚنیٚ، یاخود هەڕەشەی توندوتیژی بیڕووشیٚنیٚ و برینداری بکات.

لەکاتی پیٚگەیشتنی گاندیدا پەرەستیارەکەیی"رامبها" چەندین جار بردبووی بۆ سەیر کردنی فیلەکانی پەرستگا، کە، لە رۆژە پیرۆزەکاندا بەکۆمەڵ لەشەقامە باریٚك و پیٚچاوپیٚچەکانی پور بەندەر رەتدەبوون. ئەم فیلانە بەردەوام ریٚگەی خۆیان بەرەو دوکانی سەوزە فرۆش و میوەفرۆشییەکانی ئەمبەر و ئەوبەری جادەکە دەگۆڕی. لە دیدی پر لە پاکیی رامبهاوە، ئەم فیلانە نموونەیەکی رووناك بوون بۆ نیشاندانی کاریگەری هیٚزی مانترامی راما؟ لەکاتی تیٚپەڕین لەشەقام و بەینی دوکانەکان، لمۆزی فیلەکان وەك مار بە چەپ و راستدا دەجولاٚن، دەچوونە هەر دوکانیٚکەوە هیٚشویەك مۆزو نارگیلیان هەڵدەگرت و دەیان خستە دەمە زلەکەیانەوە. هیچ هەرەشە و





هاندانیٚ لە توانایدا نەبوو لمۆزەکان لە جوڵە بوەستیٚنیٚ. بەڵام فیلەوانە جەربەزەکان کە بەباشی فیلەکانی خۆیان دەناسی و خۆشیاندەویستن، داریٚکی خیٚزەران دەدەن بە فیلەکان تا بە لمۆزەیان هەڵی بگرن. هەر هیٚندەی کە لمۆزی فیلەکان دەپیٚچریٚت بەدەوری دارەکەدا، ئارام دەبیٚ و ئیتر هیچ ئاسەواریٚ لە نائارامی و دزینی میوە نامیٚنیٚ. فیلەکە دارخەیزەرانەکە لە بەرامبەر خۆیەوە رادەگریٚ، بەبیٚ بچوکترین روانین یاخود گرنگیدان بە نارگیل و مۆزەکانی ئەمبەر و ئەوبەری شەقامە قەرەباڵغەکان، بەشیٚوەیەکی لە خۆبایی ئاسا و سەربڵندانە، تیٚپەڕ دەبیٚ.

رامبها بە موهانداسی بچوکی دەگوت:" هزری تۆش زۆر لە لمۆزی ئەو فیلە دەچیٚ، ئەگەر سەرە داوی مانترامی گرتبیٚت، هەموو نائارامییەکان لەناودەچن و دەسڕیٚنەوە." ئەمە هەمان پەیامی بهاگاواد گیتایە کە دەڵیٚ:" هزری خۆتان لەهەر هەلومەرجیٚکدا لە شکست و سەرکەوتندا، لە بیستنی نفرین و ئافەرین، لە ئەوین و نەفرەتدا، بەچاکی ریٚك بخەن؟ ئەو کات هەنگاو بنیٚنە هەر جیٚگایەك هیچ هۆکاریٚ ناتوانیٚ لەو ئامانجانەی کە مەبەستتانە، گلتان بداتەوە، کەوا بوو دەتوانن خۆتان بە"ئازاد" ناوزەد بکەن.

مانترام، میٚشك ئارام و ئامادە دەکا و مدیتەیشن کە کلیلی گۆڕانی کەسایەتی و ویژدانی مرۆڤە، پیٚکدەهیٚنیٚ. مدیتەیشن ئایین نییە، بەڵکو شیٚوازیٚکی مەتینە و خاڵییە لە هەرجۆرە بڕوا یا دەمارگیرییەك. تەواوی وزەی چەقگیریی بۆ کاریگەری دروستکردن لەسەر ئامانجیٚکی بنچینەیی خۆبەخش دەکا و ئەو ئامانجەش دەگوازیٚتەوە قوڵاییەکانی میٚشك و خانەبەخانەی میٚشئك، تا ئەو جیٚگایەی کە، کەم کەم هەموو ئامانج و مەبەستە پوچەکان دەخوات و لەناوی دەبا. بە پەنابردنە بەر ئەم شیٚوازە مرۆڤ دەگاتە قوڵترین چینەکانی ویژدان و هۆشیاریی، ئەو جیٚگایەی کە زریانە لەبن نەهاتووەکانی دژایەتی، شەو و رۆژ یەکسەر و بەردەوام بەیەکتردا هەڵدەشاخیٚن. بە بۆچوونی گاندی، هەر لەم قوڵاییە سەرسامانەی زەینەوەیە کە عەشق لەگەڵ ترس و

تووڕەیی پەنجە لە پەنجەی یەك گیردەکەن و سەرئەنجام هەموو ئەم هەستانە لغاو دەکا و زاڵ دەبێ بەسەریاندا.

یاسای فەرمانڕەوای سەر مدیتەیشن ئەمەیە کە مرۆڤ دەگۆڕێ بە شتێك کە، هزری جێگیر یاخود چەقگیر کردووە لەسەری. ئەوشتەی کە گاندی هزر و دڵە پەیوەست و یەکپارچەکەی خۆی لەسەر چەقگیر(متمرکز) دەکات، دروشمی بهاگاوادگیتایە. بۆ ئەوەی ببی بە پیاوێك کە لەپێناو خۆشەویستی خزمەتکردن بە خەڵك، چاوپۆشی لە هەموو شتێك دەکات و بە ئازادی و بە شادی دەژی.



**لەمەراسیمی پارانەوەدا**

(*هەژدە بەیتی کۆتایی لە بەشی دووەمی گیتا، نهێنیی هونەری ژیان بە شێوەیەکی پێچراوەیی(ئاڵۆز) دەگێڕێتەوە.*





*"...هەر لەوکاتەوە، بەیتەکانی بەشی دووەمی گیتا لەسەر تابلۆی دڵم نەخش بووە. لە چاوی مندا ئەم بەیتانە، هەموو زانستیان بەشاراوەیی لە خۆدا هەڵگرتووە و ئەو ڕاستیانەی کە بەمنی فێر دەکەن، بریتین لە ڕاستییە هەمیشەییەکان، هەرچەندە کە پێویستیان بە بەڵگەهێنانەوەش هەیە، بەڵام ئەو شتەی دەیگێڕنەوە حیکمەتێکی-ئیشراقی-(٥٧)یە.*

*"لەوکاتە بەدواوە وەرگێڕان و شیکردنەوەی زۆرم خوێندۆتەوە تا ئەو جێگەیەی کە حەزم پێی بووە بەدواداچوونم هەبووە بۆی و لەبارەیانەوە دەستم بەرەخنەگرتن و بیرکردنەوە کردووە، بەڵام ئەو هەستەی کە جاری یەکەمی خوێندنەوەی گیتا لە مندا دروستیکرد، هیچکات لە یادم نەکردووە. ئەم بەیتانە کلیلی تێگەیشتنی گیتایە."*

بەشی دووەمی گیتا بە ڕوونکردنەوەی بڵندترین لوتکەی هۆشیاری کە بۆی هەیە تاکێك پێی بگات بەکۆتا دێ. ئەم بەشە ڕوونکردنەوەی بێ کەموکوڕی هەموو ئامانجەکانی گیتایە. لەوێ شری کریشنا بە ئارجۆنا دەڵێ کاتێ ئەوین بەو ئەندازەیەی کەپێویستیەتی قوڵ بێتەوە، هەموو حەزە خۆویستانەکان باروبنە دەپێچنەوە و لەدوای هەستکردن بە نائومێدی و ناکامی و نائارامی، هەموو لە ناودەچن و دەسڕێنەوە. ئارجۆنا بێ سەبرانە و بە خرۆشەوە دەپرسێ:"لەئەگەری بینینی وەها کەسێك چۆن دەتوانم بیناسمەوە؟ نیشانەکانی ئەو کەسە چییە کە هەمیشە بەعەقڵ دەژی و بەوپەڕی ڕێکوپێکییەوە لە خۆیدا پەروەردەی کردووە؟ پێم بڵێ ئەو چۆن دەدوێت؟ چۆن هەڵسوکەوت دەکا و کاتێ هێرشی دەکرێتەسەر کاردانەوەی چییە؟

کریشنا بەم شێوەیە وەڵام دادەتەوە:

ئەوکەسەی کە بەعەقڵ دەژی،

٥٧- کۆمەڵە زانایەکن کە پەیڕەوی ڕێبازی ئەفلاتونن، باوەڕیان بە هەستکردن لە ڕێگەی سروشتەوە هەیە. وەك.

خۆی لە هەمواندا و هەموانیش لە خۆیدا دەبینێ.
و عەشقی بە پەروەدگاری عەشق
هەموو ئاواتە خۆویستانەکانی لەودا سڕیوەتەوە کە ئەشکەنجەدەری ڕۆحن
لە دڵیدا نە نیگەرانی لە سەختی ڕێگایەك هەیە
و نە ئارەزوی چێژ، جێگایەکی هەیە.
کەواتە لە هەوەس، توڕەیی و ترس
ئیدی ڕزگار بووە.
بازنەی هۆگرییە کەسییەکانی
لە گەردنی گیانی کردۆتەوە
بەرژەوەندیخوازی لە دڵ دوور خستۆتەوە
نە بەختی باش شەپۆلێکی شادی دەخاتە سەر روخساری،
نە چارەنووسی خراپ خەفەتباری دەکات.
کەواتە، ڕۆشنبینەکان بەم شێوەیەن...

بیرکردنەوە لە ژین و تایبەتمەندییەکانی
پابەندت دەکا پێیانەوە.
پابەندی، لەدڵدا ئارەزو پەروەردە دەکات.
و ئارەزوو چییە؟
ئارەزوو جگە لە هەبوونی"هەوەس" شتێکی تر نییە.
و هەرهێندەی نەتوانین ببینە خاوەنی،
توڕەیی دەگاتە جێ.





توڕەیی، هێزی لەیەك جیاکردنەوەی تۆ لە پشت پەردەوە دادەنێ
توانای ئەزموون وەرگرتنت لە هەڵەکان لێ دەسێنێ.
کاتێ کە هێزی جیاکردنەوەت لەدەستدا
ژیانت سەراپا داوە بە بادا.
بەڵام کە لەجیهانی هەستپێکراوەکان دەرچیت
لە بەندیخانەی هۆگری و بێزارییەکان ڕزگار دەبیت
ئاشتی و یەکێتی دەگاتە جێ.
ئازارەکان بەکۆتا دێن،
ژیانت نوقمی نوری مەعریفەت دەبێت.

دڵی پەرت و بڵاو لە حیکمەت بەدوورە
نە توانای بیرکردنەوە هەیە تیایدا و
نە ڕێگەیەکی ئاشتی و تەبایی دەبینێتەوە
کاتێکیش نەیزانی ئاشتی و ئارامی چییە
ڕێگەی مەملەکەتی چێژ نادۆزێتەوە.
ئەو دڵەی کە بە پیر هەوەس-شەهوەت-ەوە چوو
هێزی جیاکاری خۆی وەك بەلەمێ
دەداتە دەست با و زریان و بەرەو لەناوچوونی دەبا...

ئەوکەسەی کە قەفەسی"خود"ی شکاند
و بەیەك جاری لە"من و ئێمە"کان دەرباز بوو

گەیشتە پەروەردگاری ئەوین و

پەیوەندی بەئەوەوە کرد

چ پلەیەك لەمە بەرێزتر و بەرزترە؟

کەواتە پەیوەندی بکە بەوەها جێگەیەکەوە!

و لەمەرگەوە پەیوەندی بکە بەنەمرییەوە!

# گاندی، وەك مرۆڤ

(لویی فیشەر)[٥٨]ی رۆژنامەنووسی ئەمریکی، کە چەندین ساڵ خەباتی گاندی لە هیندستاندا خستبووە ژێر چاودێری خۆیەوە، خووی بە کارە سەرسوڕهێنەرەکانی حیکمەتی پراکتیکیی ئەم پیاوە وردیلانەیە گرتبوو، کەوەها سەرکەوتووانە یاسای ئەوینی لە جەنگ و جەداڵە پڕ لە ئاشوب و گەمەسیاسییە پشت ئەستورەکان بەهێز-ی بەکار دەهێنا. بەڵام سەرئەنجام کاتێ توانی بچێتە دیداری گاندی لە ماڵەکەیدا، ئەو هۆکارەی کە دڵی داگیر کرد، گاندی وەك مرۆڤێك بوو، نەك گاندیی سیاسەتمەدار. ئەو شادومانییە هەمیشەییە، ئەو گەرم و گوڕییە و ئەو هێزە لە سەرخۆیە، بەڵام خۆڕاگری و ئەو روو خۆشییە هەمیشەیی وشادومانییە بێ ئۆقرەیە بوو کە هەتا ناو دڵی(فیشەر)، رۆچوو. ئەو، پیاوێکی لە بەرامبەر خۆیدا بینی کە تا رادەیەك خاوەنی هیچ شتێ نییە، بەڵام خاوەنی ئەزموونێکی زۆر دەوڵەمەندی دەرونی یە؟ ئەو پیاوەی کە وابەدەردەکەوێ لە دەست چەندین بەڵای جۆراوجۆر و لێدانی بێ کۆتایی دەستی رۆژگار لە رەنج و نارەحەتیدایە، بەڵام هیچکات میهرەبانی و رووخۆشی خۆی لەدەست نادا، ئەو پیاوەی زیاتر لە٦ یا ٧ کتێبی نییە لەسەر مێزەکەی، بەڵام پڕاوپڕە لە زانستی پراکتیکی.

فیشەر یەك هەفتەی لەگەڵ گاندیدا بەسەر برد. هەموو رۆژێ دەیبینی، لە گەڵی دەچوو بۆ رێپێوان و دەبووە هاوسفرەی و وەك سەدان میوانی تر، کاریگەری ئەو جادووەی لەسەر بوو کە ناوی-پەرجوی[٥٩] کەسێتی- لێنابوو. لەکاتی

58- Iouis fischer.

٥٩- پەرجو، لەزمانی کوردیدا بەواتای(موعجیزە)یە.وە، ك.





جودابوونەوەشدا بەو هەستە لەبن نەهاتووەوە ئەوی بەجێ دەهێشت، کە گرینگترین ئەزموونەکانی ئەو لە بنچینەدا لە جیهانی سیاسیدا نییە، بەڵکو لە باری هونەری ژیانی واتادارداییە لە جیهانی پڕ لە مشتومڕ و توندوتیژی و گۆڕانکارییە بەردەوامەکاندا.

(مایستر ئیخارت)[٦٠] لە-عارف-انی ئەڵمانیی سەدەکانی ناوەڕاست نووسیویەتی: خەڵك دەبێ کەمتر بیر لەو شتە بکەنەوە کە ئەنجامی دەدەن و پتر بیر لەوە بکەنەوە کە دەبێ چی بن. ئەگەر تەنها ژیانیان باش بێت، کردەوەشیان پرشنگدار دەبێت. گاندی تەنها بیر لەوە دەکاتەوە کە دەبێ چی بێت و هەرشتێ کە ئەنجامی دەدا، بە جوانی دەدرەوشایەوە، لەدیدی ئەو کەسانەی کە دەیان بینی تەنانەت دوژمنەکانیشی، لەچاوی ئەواندا ئەم هونەرمەندێکی تەواو لێهاتوو بوو، کە بچووکترین بەشەکانی ژیانی خۆیی گۆڕی بوو بە بەرهەمێکی هونەری.

"ژیانی من-یەکە-یەکی شێکارنەکراوە، هەموو چالاکییەکانم پەیوەستن بەیەکترەوە و هەموویان لە ئەوینی بەکۆتانەهاتووی من بەرامبەر بە مرۆڤایەتی سەرچاوە دەگرن."

گاندی پاشتر دانی پێدادەنێ کە، هاوسەرەکەی(کاستوربای) ئەوی فێری خۆشویستن کردووە. کاستوربای بەکرداری خۆی، رێگەی ریشەکێش کردنی قین و هەستی پێشبڕکێ کردنی پێ نیشاندا کە، مەترسی تەواوی لەسەر ژیانی هاوسەرایەتییان هەبوو. هیچکات هەوڵی تۆڵەسەندنەوە و خراپترکردنی بارەکەی نەدا، بەڵکو بەهەوڵی بەردەوامی لە کاتی هەڵچوونی قین و هەڵەکانی گاندی خۆڕاگری دەنواند. هەمیشە خاڵە ئەرێنییەکانی کەسایەتیی گاندی لەبەرچاو دەگرت و بەخۆڕاگری و بێدەنگی، وای لێکرد کە رێزی هاوسەرەکەی بگرێت. کەم کەم گاندی بۆی دەرکەوت ئەو شتەی کە خودی خۆی هەمیشە وەك ئامانجێکی تیۆری ستایشی دەکرد، هاوسەرەکەی لە

60- Meister Eckhart

ژیانی رۆژانەیدا بەکاری دەهێنێ. ناوبراوی بە سومبولّی خۆی دانا و بەم شێوەیە هەریەکێکیان بووە مامۆستای ئەوی دیکە. گاندی لە کاستورباییەوە فێرە بەخشندەیی دەبوو و لەبەرامبەردا، سۆز و رووخۆشیی خۆیی لە رووی ئەودا دەردەبڕی. رێگەیەکی دژوار و دوورودرێژ و سەخت و ماندووکەری لە پێشدا بوو، وەك خۆی دەڵێ:" خۆڕاگری کەسێکی دەخواست کە دەیەوێ ئاوی دەریا دڵۆپ دڵۆپ بە قامیش خاڵی بکات". بەلاّم هەر جارێ کە بەسەر بەربەستێکدا سەردەکەوتن، بۆیان دەردەکەوت کە نەك هەر ئەوەی توانیویانە پتر لە جاران ئەویندارى یەکتر بن، بەڵکو لە بەرامبەر خەڵکیشدا خۆڕاگری و ئەوینێکی زیاتریان لە دڵدا بینیوەتەوە. کاتێ کە گاندی فێر بوو تەنانەت ئەم ئەوینە پێشکەشی دوژمنەکانیشی بکات، کاستورباییش کەوتبووە بەندیخانە و ئافرەتانی تریش لە دەوری کۆبوونەوە و رازی بوون بە رابەرایەتی ئەو.

گاندی چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد کە شوێنکەوتوانی بەخێرایی بەم گۆڕانکارییە بگەن و یەکشەوە ئەو دۆخانە بە دوورخەنەوە کە بەدرێژایی ملیۆنەها ساڵ پێگەیشتنی مرۆڤایەتی بوونەتە رێگر و دوژمنانی خۆیان لە خۆیان زیاتر خۆش بوێت. خودی خۆی چەندەها جار لە هەوڵەکانیدا بۆ وەدەستهێنانی ئەم لوتکە بەرزە، رووبەڕووی شکست بوویەوە. بەشوێنکەوتوانی دەگوت:" هەر لەو شوێنەوە کە هەن دەسبەکار بن؟ بۆ نموونە گەر ناتوانن شا(جۆرج)ی پێنجەم یا(وینستۆن چەرچڵ)تان خۆش بوێ، لە هاوسەر و منداڵەکانی خۆتانەوە دەست پێ بکەن، هەوڵ بدەن خۆشگوزەرانی ئەوان بخەنە پێش خۆشگوزەرانی خۆتان؟ پاشان کەم کەم ئەم بازنەی ئەوینە فراوانتر بکەن. لە بیرتان بێ، تا ئەو کاتەی کە ئەوپەڕی هەوڵی خۆتان دەخەنەگەڕ، باسکردن لە شکست بێ واتایە " ئەمە نەریتێکە کە گاندی بە پەنا وەبەربردنی ئاستی توانای خۆیی بۆ گەیشتن بە ساتیاگراهایی پەرەپێدا و قوڵترین هاندەرێکە مرۆڤ دەتوانێ لە دەروونی خۆیدا بەدەستی بێنێت، چونکە راستەوخۆ وەلاّمی قوڵترین پێویستیی دەداتەوە، واتە پێویستی بە عەشق.





"عەشق هیچکات داوا ناکات، بەڵکو هەمیشە دەبەخشێت. عاشق هەمیشە لە ئازاردایە، هەرگیز نارەنجێ، هەرگیز تۆڵە ناسێنێتەوە.

*"دەبێ نەك هەر وەکو پەیڕەوێکی تاکەکەسی بنواڕیتە راستی و ناتوندوتیژی، بەڵکو وەك رێگە و یاسای کۆمەڵ و کۆمەڵگا و گەلان سەیر بکرێت. ئەو شتەی کە هەمیشە لە یادم دایە و بەدوویدا وێڵم، بەدەستهێنانی ئەم جۆرە روانگەیە، ژیان و مەرگی من، هەموو لە رێگەی بەدەست هێنانی ئەم ئامانجەیە. باوەڕم یارمەتیدەرمە بۆ ئەوەی هەموو رۆژێ چەند راستییەکی نوێ لەبەر چاوانمدا دەرکەوێ.*



**کاستوربای لە ساڵی ١٩٣٤، لە تەمەنی شەست و پێنج ساڵیدا**

*"ئەهیمسا تایبەتمەندیی رۆحە، کەواتە دەبێ هەموو لایەك هەر هەمووی لە بوار و بابەتەکانی رۆژانەدا بەکاری بێنن. گەر نەتوانرێ لە هەموو بوارەکاندا پەنای وەبەر ببردرێت، هیچ بەهایەکی زانستیی نامێنێت."*

گاندی بەدرێژایی خولی ژیانی، بناغەی چەند ئیشرامێکی دانا. ئافرەتـان، پیـاو و مندالّ، بەهەر پێشینەیەك و نەتەوەیەکەوە بۆ وەرگرتنی سومبولێك لە ژیانی رۆژانـەی ئەو، و فێربوونی وانەی ئەوین و ناتوندوتیژی وەك پایە و بنچینەی ژیان دەهاتنە ئەویّ و لەگـەلّ ئـەو دەژیـان. لـە سـەرەتاکانی بزووتنـەوەی هیندسـتاندا، خـەلّك بـۆ وەهـا فێرکارییەك دەهاتنە لای ئەو. دەهاتنە ئیـشرامی سـابارماتی، لـە بەرامبـەر ئـاش-ە غەمبار و ماتەمەکانی کارخانەی رستن و چنینی"ئەحمـەدئاوا". ئـەم شـوێنە ١٥ سـالّ مالّی ئەو بوو. گاندی لە ئیشرامی سابارماتییەوە دەستی بە رابەرایەتی" بزووتنەوەی رستن و چنینی قوماش"- لە مالّـدا-و(سـاتیاگراهای خـویّ)ی لـە سـالّی١٩٣٠کـرد، بەلاّم کاتیّ کە کارەکەی وەهای خواست کە ئیشرامی سـابارماتی تایبـەت بکـات بـە خزمـەتی(هـاریجن)ەکـان؟ بـۆ گونـدیّ لـە ناوەنـدی هیندسـتاندا کۆچـی کـرد، (هێلانە)مالّەکەی خۆی لە نێوان خەلّکی ئەم گوندەدا هەلّبژارد. ئەو ئیشرامەی کە لـە دەوری پێـك هـات، نـاوی بـە ئیـشرامی"سـواگرام" دەرکـرد، کـە واتـا زاراوەییەکـەی"گونـدی خزمـەتکردن"ە، گانـدی بەوپـەڕی وردبینییـەوە شـوێنی ئیشرامەکەی حەوت میل دوورتر لە ئاوەدانی هەلّبژارد، لە ناوچەیەکی تەواو گەرمدا، زۆربەی هیندییەکان لە وەها کەش و هەوایەکدا دەژیان، هەر لەبەر ئەم هۆیە بـوو کـە گاندی وای بەباش زانی لەبری ژیان لە ناوچەیەکی کوێستانی فێنك یا ناوچـەیەکی بـە پیت وفەڕ لەکەنار روباری(گۆنگ)، لەم ناوچە کەش و هەوا خراپەدا بژی. لەوانـە بێـت مەبەستی بووبێت لە گۆشەگیریدا بژی، بەلاّم لـەماوەی چـەند سـالّێکدا هێنـدە خـەلّك هاتوچۆی ئیشرامیان کرد، کە لـە ژێـر پێیانـدا جادەیـەك دروسـت بـوو. لـە چـەندەها شوێنی جیاوازەوە هێندە نامە و بروسکەی بۆ چوو، حکومـەت ناچـار بـوو بنکەیـەکی پۆستە و گەیاندن لەو ناوچەیە بکاتەوە، لـە ئیـشرامی سـواگرامدا جـۆش و خـرۆش و هاتوچۆ و چالاکی کەوتبووە سەرپیّ و هەموو جیهان دەیانتوانی لە واتای ئەم رسـتەیە بگەن کە بچووکترین کرداری رۆژانەش دەبیّ بە عەشق بێت.







**لەکاتی گەمەکردن لەگەلّ منداڵێکدا**

"*دەبیّ بڕواننە ژیانی من: ئەمەی کە چۆن دەژیم، چۆن خۆراك دەخـۆم، دادەنیـشم، دەدوێم، چۆن هەلّسوکەوت دەکەم. سەرجەمی ئەمانە ئایینی من پێك دەهێنیّ.*"

گاندی بەیانیان زۆر زوو لە خەو هەلّدەسا، هەموو رۆژیّ کاتـژمێر٣ یـا٤ی بـەیانی لە خەو هەلّدەسا بـۆ ئـەوەی سـوود لـە کـەش و هـەوای سـارد و ئـارامی بەرەبـەیانی هیندستان وەرگریّ. ئەم ساتانەی رۆژ، کاتێکە کە مێشك بە شێوەیەکی سروشـتی لـە ئارامترین باری خۆیدایە. گاندی لە کاتی سەختترین قەیرانـە جەماوەرییەکانـدا، چ لـە لەنـدەن و چ لـە شـەمەندەنەفەردا و چ کاتێـك کـە لـە ژوورەکـەی زیندانـدا"یـەکیّ لەمیوانخانە شاهانەکان"دابوو، هەرگیز لە سوود وەرگرتنی ئەم ساتانە بـۆ ئەنجامـدانی مدیتەیشن"بەشێوەیەکی تەواو دابڕاوانـە لـە دەوروبـەر "خافـلّ نـەدەبوو. ئـەم کاتـە،

گرنگترین بەشی ژیانی رۆژانەی ئەوی پێك دەهێنا، تەنانەت گرنگتر لە کاتی خواردن؟ چونکە هەموو رۆژێ شەپۆلێکی لەو وزەیەی کە گیانێکی نوێی دەدایە خانەبەخانەی لەشی، بەرەو لای ئەو رەوانە دەکرد. ئەم ساتانەی دەمەو بەیان بەدرێژایی کاتەکانی تری رۆژ، خۆراگری و شەهامەت و میهرەبانی و رووخۆشی پێدەبەخشی.

پاش لێبوونەوە لە مدیتەیشن، خەریکی کاروباری رۆژانەی دەبوو. هەر خولەکێك لە ژیانی رۆژانەی بۆ خەڵك تەرخان دەکرد و یەکەم کاری بریتی بوو لە چاوپێکەوتنی لەگەڵ لافاوی بەردەوامی سەردانیکەرانی، کە لەبەر چەندین هۆی وەك- دیدار و چاوپێکەوتن بۆ گۆڤاری نیۆیۆرك تایمز، پرسیار لە بارەی مافی دەنگدانی(هاریجن)ەکان، باس و وتووێژ لەمەر بۆچوونەکانی ئەو سەبارەت بە کۆنترۆڵکردنی ژمارەی دانیشتوان، یا پرس و را پێکردنی سەبارەت بە پەروەردەکردنی منداڵی لاسار- لەهەرشوێنێکی جیهانەوە دەهاتنە لای. لە پاش ئەو کەسانەوە کە بۆ وتووێژ لەگەڵ گاندی دەهاتن، کۆمەڵێك بێ دەنگ دەوەستان، کۆمەڵێکیش تەنها بۆ تەماشەی ئەم"پیاوە وردیلانە هەژارەی سواگرام" دەهاتنە ئەوێ، کە بچووکترین بەشەکانی ژیانیشی شایانی تێروانین بوو. ئەوانیش لەگەڵ گاندی کە لە هەرشوێنێك لەگەڵ خۆی لە ئاشتیدا بوو" راستەوخۆ هەستیان بە ئاسوودەیی دەکرد"؟ دەتوت کە هەمیشە سەربە سواگرام بوونە و ئەوانیش بەشدارن لە خێزانە مەزنەکەی ژێر سایەی سەرپەرشتیی گاندی، گاندی بەهەمان ئەندازەی خەڵکانی دی ئاگاداری ئەوانیش بوو، هەریەك لەوانیشی بەجۆرێك لە بەرنامە چڕەکەی رۆژانەیدا دەگونجاند. لە کاتی رێپێوانی بەرەبەیاندا یا خواردنی ژەمی بەیانی یا کاتی داورێسان، وتوێژی لەگەڵ دەکردن. هەرگیز کەمترین سات بۆ خەڵوەت و تەنهایی نەدەمایەوە. هەموو کردەوەیەکی لە بەرچاوی بێگانەکاندا بوو، جارێکیان هاوکارەکەی(مریبار) نامەیەکی بۆ نووسی و داوای لێبووردنی لێکرد بە هۆی ئەوەوە کە گوایا رۆژی پێشتر کاتی لێگرتبوو





و بەبۆچوونی خۆی تێکدانی ساتە تەنها و ئارامەکانی گاندی کە بەسەختی بۆی رەخسابوو؟

گاندی لە وەڵامیدا بۆی نووسی:" بەڕێزتان کاتی تەنهایی منتان تێك نەداوە، تەنهایی من لە نێوان کۆمەڵدایە."



**ساڵی ١٩٣٩؛ لەگەڵ جەواهر لەعل نەهرۆ لە ئیشرامی سواگرام**

گاندی لەنێو ئەم ژلێوە رووکەشییانەدا درێژەی بەسەقامگیریی خۆی دەدا، ئەمە لەگەڵ وردبوونەوەیەکی سەختگیرانە لەمەڕ وردەکاری و کات و ساتی بەرنامەکانی. زۆر وردبین و لە هەمانکاتدا کاتی زۆر بەلاوە گرنگ بوو. چاوەڕوانی ئەوە بوو لە هەرکەسێ کە دەهاتە لای پێوەرەکانی ئەو لە بواری گرنگی کاتدا لەبەرچاو بگرن، تەنانەت گرنگترین وەزیرە ئینگلیزەکانیش. ناوبراو لە شوێنێکدا بەم شێوەیە

دەنووسیٚ:"نابیٚ یەك دنكە برنج یاخود پارچـەیەك كاغـەز بەبـەلاش لەدەست بـدەن؟ هەروەها كاتیش. كاتی ئێمە هی خودی ئێمە نییە، بەڵكو گەل خاوەنییەتی و ئێمەش ئەمانەتدارین و دەبیٚ بە باشترین شێواز بەهرەمەند بین لێی."

لەو ساڵە پڕلە ئاژەوانەدا، زۆربەی چالاكییەكانی رۆژانە پڕبوو لە گوشار و تەنگ و چەڵەمە و تێهەڵچوون، زۆرجار واپێشدەهات كە جەواهر لەعل نەهرۆ یـا یـەكێكی تـر لەپێشەوا سیاسییە گەورەكانی هیندستان،

لەگەڵ نەهرۆ لە ساڵی ١٩٤٦.

بە كۆڵەباریٚ لەو گرفتانەی كـە كـاری دەكـردە سـەر ژیـانی ملیۆنـەها نەفـەر، لـە دوورترین ناوچەی نیمچە كیشوەری هیندییەوە دەهاتنە لای گاندی و لەنەكاو سـەریان لە سواگرام هەڵدەدا. بەڵام وەك هەمیشە، لە پاش چەند خولەكێك و لەگەڵ بوونی ئەو بارە دەروونیانەوە، خۆیان بەدەم پێكەنینەوە بەیەكیٚ لە نوكتەكانی گاندی دەبینـەوە و كاتی بەرێكەوتن، لە ژێر كاریگەریی ئـەو كەسـایەتییە پـەرجو(مـوعجزە) ئاسـایەدا،





دووبارە لە دەروونـدا هەستیان بەئارامی و ئۆقرە دەكردەوە، خۆیان بە پڕاوپڕ لـە شـادی و ورە دەبینییەوە و جارێكی دیكە لە توانایاندا بوو بە دیـدێكی روونـاكتر و هێزێكـی زیاترەوە باری گرفتـەكان لـە ئەسـتۆ بگـرن، جگـە لـە قەیرانـە سـەختە جـەماوەری و سیاسییەكان، گرفت و كێشە ناوچەییە بەردەوامەكانیش سەریان هەڵدەدا، گرفتی وەك بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لە نێوان ئاژەڵە ماڵییەكاندا و لـەدەمی مەرگـدابوونی منـداڵیٚ بە هۆی نەخۆشی(هەوكردنی سییەكان)ەوە و یاخود پیاوێك كە لە یەكیٚ لە گوندەكانی نزیـك ئـەو ناوچـەیە دەهـات و داوای روخـسەتی لـە گانـدی دەكـرد بـۆ ئـەوەی لـە هاوسەرەكەی جیابێتەوە، گاندی هەموو رۆژیٚ گیرۆدەی ئەم گێرمە و كێشانە بوو و لـە پشت هەموویانەوە، گـرفتی پەرەسـەندووی هـەژارانی هیندسـتان خـۆی دەنوانـد، ئـەو هەژارانەی كە گاندی بەرپرسیارێتیی رابەرایەتی كردنیانی بە تەرخانكردنی بەشێك لـە ژیانی رۆژانەی خۆی بۆ ئەوان بۆ گەیشتن بە خۆبـەڕێوەبردن و سـەربەخۆیی بەتـەنها لـە ئەستۆ گرتبوو. ئەو بە ناسكی سەماكەرێكی هونەرمەند، بە رووخۆشی و نەرمییـەكی هەمیشەیی، خۆی دەخستە ناو جەرگەی ئەم ئاژاوەنـەوە؟ دروسـت وەك سـەنگینی و قوڵایی زەریای ئاشتی و ئارامی كـە وەك بهاگاوادگیتـا دەڵـیٚ، رووبـارە بەخرۆشـەكان دەرژێنەوە ناوی و ئارام دەبن.

بەڵام جوانی گاندی پتر لە هەركاتیٚ لە نێوان خێزانی ئیشرامەكەیدا خۆی دەنوانـد. ئیشرام كۆمەڵەیەكی بێگانـە بـوو، سـەدان ژن و پیـاو و منـداڵ لـە هـەر جێگەیـەكی جیهانەوە تیایدا كۆببوونـەوە. پێـشینەی ئـەم كەسـانە وەهـا جۆراوجـۆر بـوو(سـەردار ڤالابایی پاتڵ)[٦١] تورە و بێتاقەت كە لە یەكەمین رۆژانی ساتیاگراهایی هیندستانەوە لەگـەڵ گانـدی بـوو، بـۆ گاڵتـە پێـی دەوت "ئیـشرامی باخـچەی ئـاژەڵان". گانـدی هەنگاوی دەنایە هەرجێگەیـەك چـەندین ژن و پیـاوی بـۆ خـۆی رادەكێـشا، ئـەو ژن و پیاوانەی كە ئەوینیان بۆ گاندی، دەرگای خەزێنەیـەكی مـەزنی دلێـری و وەفـاداری و

61- Sardar vallabhbhai patel

خزمەتی پاك و بێ لەکەی لەواندا کردبوویەوە و ژیانیانی گۆڕی بوو. تەنانەت لە ئەفریقیای باشوریش کاتێ ناوبانگی خێزانەکەی بڵاو بوویەوە خەڵکانێکی زۆر بە جۆرەها پێشینەی جیاوازەوە پەیوەندییان بە خێزانەکەیەوە کرد و خۆیان بە تەواوی تەرخان کرد بۆ خزمەتی ئەو ڕێگایەی کە گرتبوویەبەر.

زۆربەیان لە دەرکی قوڵی گاندی تێگەیشتبوون، لە هێزی بێدەنگ بەڵام کاریگەری لێنەکراوی خۆڕاگریی ئافرەت و ڕۆحی فیداکاریی و ئەو توانای لێبوردنەی کە هەیەتی و بەتەواوی بەرەورووی کێش کرابوون. گاندی وەها باس لە ئافرەت دەکات:"گەر ناتوندوتیژی یاسای بوونی ئێمەیە، کەواتە ئاینده بۆ ئافرەتانە." دەرگای ماڵی گاندی هەمیشە بۆ وەرگرتنی هەموو ئافرەتان وەك ئەندامی خێزان کراوە بوو و لەو ڕوانگەوە کە فێرببوو چۆن ئەوینی لەبەرامبەر کاستوربای و منداڵەکانییەوە بەرەو هەموو خەڵك بڵاوە پێ بکات، هیچکات ماڵەکەی پڕ نەدەبوویەوە و بێ جێگە نەدەبوو، چونکە هەموو دانیشتوانی جیهان ئەندامانی خێزانی وی بوون. ڕۆژێك کاستوربای لە وەڵامی پرسیاری پەیامنێرێك کە لەژمارەی منداڵەکانی پرسیبوو، بەوپەڕی زۆرزانییەوە وەڵامی دایەوە:"من چوار منداڵم هەیە. بەڵام هاوسەرەکەم(بابۆ)[62]، چوارسەد ملیۆن منداڵی هەیە."

جوانترین دیمەنی کەسایەتیی گاندی، پەیوەندییە ئەویندارانەکەی بوو لەگەڵ هەریەك لە سەدان ئەندامی خێزانەکەی لە ئیشرامدا. گشت لایەن و وردەکارییەکانی ژیانیان بۆ ئەم گرنگ بوو و لە هەمانکاتدا کە چاوەڕوانی زۆری هەبوو لە ئەوانەی کە بەدەورییەوە بوون، هەڵسوکەوتی لەگەڵیان پڕ بوو لە ئەوین و ڕووخۆشی و چارەسازی. لەگەڵ هەریەك لە ئەندامانی خێزانی پەیوەندییەکی تایبەت و سەربەخۆی هەبوو. تەنانەت ئاگاداری

٦٢- بابۆ، بە واتای باوك دێت و نازناوێکە کە خەڵکی هیندستان بە گاندییان دەگوت.





بچووکترین وردەکارییەکانی ژیانی خەڵك بوو، زۆربەی کات بەتێبینییە ورد و هەستیارەکانی لەمەڕ بچووکترین پێداویستییەکانیان، دەوروبەرەکانی شەرمەزار دەبوون.



**لەگەڵ نەوەی براکەی(مانوبن گاندی) و خاتوو (ئابها گاندی)، کە لە دوایین ڕۆژەکانی تەمەنیدا لەگەڵیاندابوو**

ساکارترین کارەکانی ئیشرامیش لە چاوە وردبینەکانی دەرباز نەدەبوو؟ خووی هەمیشەیی بریتی بوو لە پیاسەی دوای نیوەڕۆیان لە ئیشرامدا و گاڵتەو گەپ و یاری لەگەڵ منداڵان و سەردانی ئیش و کارەکانی نێو چێشتخانە. بەرامبەر بە نەخۆشەکانی ئیشرام ئەوینێکی تایبەتی هەبوو و هەموو حەز و ئارەزووی منداڵیی خۆی لە بۆ پەرستیار بوون، پێشکەش بەوانی دەکرد؟ هەمیشە بەدیارییەکی بچووکەوە بۆ یەك بەیەکی نەخۆشەکان دەچووە ژوورە تایبەتییەکانیان و سەردانی دەکردن. ئامادەبوونی ئەو لە هەر کۆڕێکدا دەبووە مایەی شادی و خۆشییەکی

تایبەتمەند. لویی فیشەر، لەیەکێ لە راپۆرتەکاندا باس لەو بەیانییە دەکات کە بەدەنگی یەکێك لە ئافرەتەکانی ئیشرام کە وەك نەوجەوانێکی کەم تەمەن لە ژوورەکەی تەنیشتیدا لەبەر خۆیەوە گۆرانی دەوت خەبەری بوویەوە. کاتێ ئافرەتەکە لە ژوورەکەیەوە هاتە هەیوانەکە، فیشەر هۆی گۆرانی وتنەکەی لێ پرسی، ئافرەتەکە لەوەڵامدا گوتی:"لەبەر ئەوەی خۆشحاڵم" دیسانەوە لە وەڵامی فیشەردا کە لێی پرسی:"بۆچی خۆشحاڵی؟" بەدەم پێکەنینەوە وتی:"خۆشحاڵم چونکە لای بابۆم!"

جۆری ژەمی ئێوارەی ئیشرامی سواگرام هەمیشە دەبووە مایەی سەرسوڕمان بۆ ئەوانەی کە تازە دەهاتن. گاندی گرنگی بە چێژی خواردنەکە یاخود ئەوەی کە مەیلکەرەوەبێت نەدەدا؟ لە دیدی ئەودا وەك کەسێ کە بەنزین دەکاتە ئۆتۆمۆبیلەکەی ، خۆراکی دەدایە جەستەی خۆی. ئامۆژگاریی خەڵکی دیی دەکرد کە:" تەنها ئەو شتە بخۆن کە جەستەتان پێویستیەتی، تەنها کاتێ کە برسیتانە و ئەویش ئەوکاتەی کە هیچ نەبێ بەکارێکی بچووك هەستابن بۆکەسێك. هەروەك سەردەمێ کە قوتابی خوێندنی باڵا بوو لە لەندەن هەر جۆرە تێکەڵەیەکی خۆراکە گیاییەکانی تاقی دەکردەوە، گاڵتەی بەلایەنی هونەری چێشتلێنان دەهات و گرنگی بۆ دانەدەنا. هەندێ کات دەرئەنجامی چێشتلێنانەکەی زۆر سەرسورهێنەر دەردەچوو. زۆرجار بۆ چەشتنی تامی خۆراکەکە یەکێ لەو میوانانەی کە زۆر جێگەی رێز بوون لای هەڵدەبژارد بۆ ئەوەی چێژی دووبەرامبەری هاوسفرە بوون لە گەڵ ئەودا و خواردنی سوپ یا ئەو"چاتنی"[٦٣] یەی کە پڕبوو لە ڤیتامینە نەناسراوەکان و هەندێ کاتیش بە تاڵی زەهر بوو، تاقی بکاتەوە. بەسوودبوونی خۆراکەکە لەرووی ڤیتامینەوە بەس بوو بۆ گاندی و زانینی ئەم بابەتە تامەکەی لەلاخۆش دەکرد.

٦٣- جۆرێکە لە بەهارات کە تام و چێژێکی توون(تیژ)ی هەیە.





خواردنی ژەمی ئێوارە لە ئیشرامدا بەگەرمیی مەراسیمی شیوی خواناسان"عشا ربانی" بەڕێوە دەچوو. گاندی دەیزانی کە تەنانەت بەسوودترین خۆراکەکانیش دەبێ بە خۆشەویستییەوە لێ بنرێ و هەر بە خۆشەویستیشەوە بخورێت، ورەی دەوروبەرەکانی بەگاڵتە و گەپ و پرسیارە دۆستانەکانی کە لە کاتی خۆیدابوو لە ئاستێکی بەرزدا دەهێشتەوە، زۆر کەم قسەی دەکرد بەڵام هەرکاتێ شتێ شایانی تێڕامان دەبوو، هەموو هەستی خۆیی دەخستەسەر ئەوشتە. سومبولێکی لە خۆی دروست کردبوو بۆ ئەوەی خەڵکی دی فێر بکات تەنانەت لە کاتی ئەنجامدانی بچووکترین کارەکانیشدا دەبێ بەهەموو هەستەوە جەخت بکرێتەوە سەر ئەو کارە. وەها کە لە گەرماوگەرمی هەوڵداندا نە توڕەیی و نە ترس، توانای رفاندنی ئەو هەستە چەق بەستووەیان نەبێت.

لەپاش نانی ئێوارە کە هەموو کارەکانیش بە کۆتاهاتبوون، کۆمەڵێك کۆ دەبوونەوە بۆ ئەوەی لە پیادەڕەوی شەوانەدا هاوڕێیەتیی گاندی بکەن. ئەوکاتەی کە خۆر بەرەو ئاوابوون دەڕۆیی و گەرمای ناوەندی هیندستان کەمێ بەرەو کەمبوونەوە دەچوو. دەبا گاندی وەك دەسکەوتێ هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەم ساتەوەختەدا بکردایا و لەساتە تەنهاییەکانی خۆیدا بەسەری ببردایا. بەڵام تەنانەت لەم کاتەشدا خەریك دەبوو بە وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی خەڵك و قسەکردن لەگەڵ ئەو کەسانەی کە ئارەزومەنی دیداری بوون و ئەگەر پرسیارێك لەلایەن هیچ کەسێکەوە نەکرایا، خۆی بەیاری کردن لەگەڵ منداڵانی ئیشرام خەریك دەکرد و دەیخستنە پێکەنین. هەرچەندە گاندی تەمەنی سەروو حەفتاساڵی تێدەپەڕاند، بەڵام لە پیادەڕەوییەکانیدا هەروەك جاران زۆر خێرا هەنگاوی هەڵدەنا. هێندە لەکاتی رێ رۆیشتندا سوك وسۆڵ بوو، تارادەیەك قاچی وەبەر زەوی نەدەکەوت، واتدەزانی کە دەفرێ. بۆ ماوەیەك کە لە رۆیشتندا بەردەوام دەبوون، خەڵك لە دوایەوە بەجێ دەمان و جەماوەرەکە وردەوردە کەم دەبوویەوە.

لە پاش پیادەڕەوی، مەراسیمی پاڕانەوەی شەوان لە ژێر ئاسمانی ئەو ناوچە گەرمەسێرە بەڕێوە دەچوو. کاتێك کە خۆر ئاوا دەبوو، سەدان نەفەر چرابەدەست کۆ

دەبوونەوە بۆ ئەوەی گوێ لە قسەکانی گاندی بگرن. دەنگەدەنگ هەرای دەکرد و جەماوەر وەك شەپۆلی دەریا لە هەڵچوون و داچووندا بوو. کاتێ کە گاندی لە نێو جەماوەردا بەدیار دەکەوت زۆر بچووك و لەڕ و لاواز دەبینرا، بەڵام ئامادەبوونی، جەماوەرەکەی کۆنترۆڵ دەکرد. کاتێ قسەی دەکرد زۆر بەکەمی دەستەکانی دەجوڵان؟ جەماوەر ئارام دەبوون، هەموو چاوەکان سەیری ئەو جەستە بچووکەی دەکرد کە لەسەر بەرزاییەکە دانیشتبوو.

دەنگی نەرم و خۆش بوو و هەر چەندە نزم بەدیار دەکەوت، بەڵام لە دوور دووریشەوە دەبیسترا. هەر لە خولەکەکانی سەرەتای قسەکردنەوە، هەستی جەماوەرەکەی بۆ خۆی کێش دەکرد و وەڵامی نیازەکانی دەدانەوە.



**لەکاتی مدیتەیشن-دا**





وشەکان بەهێمنی و وردبینی لە زاری دەردەچوون؟ وەها ساکارییەکی منداڵانەی تیابوو کە دەتتوانی هەست بە چۆنییەتی دروستبوونی بیرکردنەوەکانی بکەی. ئەو بیرکردنەوانەی کە فۆرمی چەندین وتەی ساکار بەڵام بەهێزیان وەردەگرت و دروست دەبوون. دەتوت جەستەی خۆیی بە بێ بایەخیی لە بەرکردن(شنل)[٦٤] یك، داپۆشی بوو؟ ئەو پۆشاکەی کە هەرچەندە تەسك و کەمتر لە پێویست دەهاتە بەرچاو، بەڵام کاریگەری و هێزی کێشکردنی خودی لەبەر رانەدەگیرا و بەهێز بوو، ئەو هێزەی کە سەرچاوەکەی بریتی بوو لە وزەی لەبن نەهاتووی رۆح. کاتێ کە تاریکی دەمەو ئێواران زیاتر دادەهات، دەتوت زەمەن چەندین سەدە دەگەڕایەوە پاش و دیمەنێك لە(بودا)ی لە پشت بیست و پێنج سەدەوە نمایش دەکرد، لەوکاتەی کە نهێنییەکانی ناتوندوتیژیی فێرە جیهانێك دەکرد کە ئاژاوە باڵی بەسەردا کێشاوە.

لە مەراسیمی پاڕانەوەدا کتێبە پیرۆزەکانی هەموو ئایینەکان دەخوێندرایەوە، لەوانە قورئان، و ئامۆژگاریی سەرچیا. بەڵام ئەمە بهاگاوادگیتا بوو کە گاندی هەمیشە قوڵترین ئیلهام و رێنوێنییەکانی لێ وەردەگرت، مەهاداوی دیسای- سکرتێرەکەی گاندی، لەلایدا دادەنیشت و بەشی دووەمی گیتای دەخوێندەوە، کە لەو بەشەدا باس لە"مرۆڤی کامڵ"دەکا. هەموو ماوەی ژیانی گاندی لە هەوڵی خستنەکاری ئەم ئامانجانە لە نێو قاڵبی ژیانی رۆژانەدا تێپەڕ ببوو. دەنگدانەوەی ئایەتەکان ئاسمانی ئەو ناوەی دەتەنییەوە، گاندیت دەبینی کە رۆحی لە جیهانی مادی دەرچووە، هزری ئارامتر و لەسەرخۆتر دەبێ و رۆحی بەهێزی لە قاڵبی جەستەی جۆیێ دەبێتەوە. دەگەیشتە تەرکیزێکی وەها کە ئیدی گوێبیستی بەشی دووەمی گیتا نەدەبووی، بەڵکو بە بینین، بەچاوی خۆت دەبوویتە بینەری گۆڕانکارییەك کە گیتا بەم شێوە باسی لێوە دەکات:

---

٦٤- جۆرە پۆشاکێکی گەورە و بێ قۆڵە کە دەیدەن بەسەر شاندا.

ئەوکەسەی قەفەسی خود-ی شکاند و
بەیەکجاری لە"ئێمە و من"ەکان دەرباز بوو
بە پەروەردگاری عەشق گەیشت و
پەیوەندی کرد بە ئەوەوە
چ شوێنێك لەمە بەڕێزترە؟
کەواتە پەیوەندی بە وەها جێگەیەکەوە بکە!
لەمەرگەوە پەیوەندی بکە بە نەمری یەوە!
"فێربوونی هونەری مردن بە فێربوونی هونەری ژیان بەدەست دێ."

و لەوەها ئێوارەیەکدا دوایین تراژیدیا بەئەنجام گەیێندرا. گاندی لە دلهی بوو و هەموو کات و ساتی خۆی لە کۆششەکانیدا بۆ یەکگرتنی هیندۆسەکان و موسڵمانان بەکار دەهێنا. کاتی پاڕانەوە هات، بە هەنگاوە خێراکانی و لە کاتێکدا خۆی دابوو بەسەر شانی دووان لە کچانی ئیشرامدا، چووە شوێنی مەراسیمەکە. جەماوەرێکی زۆر بۆ بیستنی وتەکانی کۆ ببوونەوە. لە نێوان جەماوەرەکەوە رەت بوو و گەیشتە سەر بەرزاییەکە، لەپی دەستی بە هێمای بەخێرهاتن بەیەکەوە لکاند و هەتا ئاستی روخساری بەرزی کردەوە. لەم کاتەدا لاوێك کە قین چاوی کوێر کردبوو، هاتە بەرامبەر گاندی، بە هەمان شێوەی گاندی لەپی دەستی نابەیەکەوە و لەناکاو دەمانچەیەکی لە گیرفان دەرهێنا و چەند گوللەی نا بەسەر دڵی گاندییەوە. ئەو ئەوینەی کە لەدڵی ئەم پیاوە وردیلانەیەدا شەپۆلی دەدا، وەها مەزن بوو کە لە کاتی کەوتنندا جگە لە مانترامەکەی کە ببووە شازادەی قولاییەکانی دەروونی، هیچی دی بەسەر زمانیدا نەهات: راما، راما، راما. واتاکەی: لێت دەبوورم، خۆشم دەوێیت، بۆت دەپاڕێمەوە.

مرۆڤ وزەیەکی رۆحیی کۆکراوەیە کە بەسەختی لە شێوە فیزیاییەکەی خۆیدا جێی دەبێتەوە. کاتێ گشت ئومێد و خواست و حەزەکان و ئیرادە پەیوەست بن بەیەکەوە و





ببنە یەك، ئەم وزەیە تەنانەت لە کاتی ژیانیشدا لە توانایدا هەیە دەرباز بێت و تەنانەت مەرگی جەستەش ناتوانێ دووبارە بەندی بکاتەوە. گاندی خۆی کردبووە هێزی ناتوندوتیژی. ئەو، هێزێکە کە قەت نامرێ و هەرکات تاك و کۆمەڵگا، یا گەلێ بە هەموو وزە و ئیرادەیەوە رووی کردە ناتوندوتیژی، بۆ جارێکی دیکە هەڵدەسێتەوە.

جارێکیان کاتێ شەمەندەفەرەکەی گاندی لە وێستگەکەی خۆی دوور دەکەوتەوە، پەیامنێرێ راکە راکە خۆی گەیاندێ و بەدەم هەناسەبڕکێوە داوای لێکرد کە پەیامێکی بداتێ بۆ ئەوەی بیگەێنێتە گەلەکەی. گاندی لە وەڵامدا بەپەلە دێڕێکی کورتی لەسەر پارچە کاغەزێك نووسی:"پەیامی من، ژیانی منە." ئەمە پەیامێکە کە ئەنجامدانی پێویستی بە شانۆیەکی گەورە نییە بەقەت شانۆی سیاسی جیهان، بەڵکو دەتوانرێت هەر ئێستا و هەر لێرەدا بە شێوەیەکی پراکتیکی بخرێتە نێو گێرمەوکێشەکانی ژیانی رۆژانە.

*"من شتێکی نوێم پێ نییە کە گەلانی جیهانی لەسەر فێر بکەم، راستی و ناتوندوتیژی مێژوویان بەقەد مێژووی چیاکان دەبێ. هەموو ئەو شتەی کە ئەنجامم داوە، بریتی بووە لە چەند تاقیکردنەوەیەك کە لەم دوو بوارەدا بەپێی توانا ئەنجامم داوە. هەندێ جار لەم رێگەیەشدا تووشی هەڵەکردن بووم و وانە و ئەزموونم لێ وەرگرتوون. بەم شێوەیە ژیان و گرفتەکانی هەموو بۆ من وەك چەند تاقیکردنەوەیەکن بۆ گەیشتن بەراستی و ناتوندوتیژی...*

*"گشت فەلسەفەکەی من ـ گەر بتوانرێ بەم ناوە پرشان و شکۆیەوە بانگ بکرێ ـ لەوەدا خۆی حەشارداوە کە ئەنجامم داوە. بەڵام ناتوانرێ ناوی لێ بنرێ"گاندییزم"، چونکە"ییزمی" تێدانییە. رێگەی بەکارهێنانی جۆرەها دەستەواژە و زاراوەی بریقەدار و پڕوپاکەندەی تێدا نییە. هەندێ جار سوود لە کتێبە پیرۆزەکان وەرگیراوە، بە پێچەوانەی ئەم دیدگایەی منەوە و هەندێ شتیان لێ گێڕاوەتەوە، بەڵام من زیاتر*

*لە هەمیشە پابەندم بەم بۆچونەوە کە راستی قەت و لەژێر هیچ کاریگەرییەکدا نابێ بکرێتە قوربانی هیچ شتێ. ئەوکەسانەی کە بڕوایان بەو راستییە ساکارانە هەیە کە من خستومنەتە بەردید و تێڕوانین، دەتوانن بیانخەنە نێو قاڵبی ژیانیان و بەم شێوەیە بڵاویان بکەنەوە.*

*"بچووکترین گومانم نییە لەوەی کە هەر ژن و پیاوێ دەتوانێ بگاتە ئەو شوێنەی کە من پێی گەیشتووم، بەو مەرجەی کە هەمان ئەو هەوڵ و کۆششانە بخاتەکار و هەمان ئەو ئومێد و باوەڕانە لەخۆیدا پەروەردە بکات."*







سالّی١٩٤٦؟ لە کاتی ڕێپێوانی بەرەبەیاندا

## (پەیوەست)

## ناتوندوتیژی لە کردەوەدا

**لە نووسینی:"تیمۆتی فلێندرز"**

لە لاپەڕەکانی پێشوودا ئیکنات ئیسواران پێگەیشتنی کەسێتیی گاندی خستۆتە بەر لێکۆڵینەوە، وەك کەسایەتییەکی ڕۆحانی و داهێنەرێکی سیاسی، ئێستاکە دەمانەوێت بچینە نێو چینە هەرەقوڵەکانی ساتیاگراهی و بزانین چۆن دەتوانین سوود لەم شێوازە وەربگرین بۆ کێشەکانی سەردەمی ئێمە بەو شێوەیە کە گاندی باسی لێوە دەکات.

ئەو شتەی کە وەك خوویەك لە ناوهێنانی دەستەواژەی ساتیاگراها دێتە مێشکمان، شێوازێکە بۆ چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان، هەمان ئەو شێوازەی کە گاندی بەهۆیەوە هیندستانیی لەژێر دەستی داگیرکەری ئینگلیز دەرهێنا. ئەم جۆرە تێفکرینە تاڕادەیەك راستە، بەڵام ئەمە تەواوی تێگەیشتنی گاندی نییە لەم دەستەواژەیە، لەراستیدا ساتیاگراها شێوازێکە بۆ کارکردن لە پێناو چارەسەرکردنی گێرمەوکێشەکان لە چینە جیاوازەکانی پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان، بەبێ پەنابردنە بەر توندوتیژی. سوودوەرگرتن لەم شێوازە لە تاك و لە نێوان ماڵدا دەست پێ دەکات و پاشان کۆمەڵگا و دامەزراوە جیاوازەکان و پاشتریش بە نێو وڵاتەکاندا فراوان دەبێتەوە. لە هەر جێگایەك کە جیاوازییەك رووبدات چ بەشێوەی توندوتیژی و چ ناتوندوتیژی گرنگی ساتیاگراها ئاشکرا دەبێ.





بەپێی بنچینەی فکر و بیری گاندی، ساتیاگراها تەنها تەکنیك یا خود تیۆرێکی ئاسایی نییە، بەڵکو شێوازێکە بۆ ژیان. لە هەموو ئەندێشەکانیدا دەتوانرێت ئەم ڕێچکەیە بەدی بکرێت کە، هێزە سەرەکییەکانی نێو ئەم شێوازە تەنها لە ڕێگەی بەکارخستن، یا بەو شێوەیەی کە خۆی دەیگوت،"لە ڕێی ژیانەوە" ئاشکرا دەبێت. گاندی داهێنەری ساتیاگراها نییە، بەڵکو دۆزییەوە، خودی خۆی دەڵێ:"مێژووی ساتیاگراها بەقەت مێژووی چیاکانە ". گاندی بنچینەکانی شیکار کردووە. لەپانتاییەکی بەرفراواندا خستییەگەڕ، کاریگەرییەکەی نمایش کرد و لە هەمانکاتدا جەختی لە سەر ئەوە دەکردەوە کە بەکارهێنانی ساتیاگراها دەبێ سەرەتا لە تاك و "لەنێو ماڵدا" دەست پێ بکرێ.

جارێکیان کاتێ(جی.دی.بێڕلا)[٦٥]، یەکێ لە هەوادارە ملیۆنێرەکانی گاندی کە تا شوێنی کۆنفرانسی مێزگردی لەندەن هاورێیەتی گاندیی کرد، لە سەرجادە پرسیاری لێکرد کە ئایا وتارەکەی ئامادە کردووە یان نا؟

گاندی وەڵامی دایەوە:"مێشکم بەتەواوی خاڵییە. بەڵام بەڵکو خودا یارمەتیم بدات و لە کاتی پێویستدا گشت لێکدانەوە و بیرم بخەمە سەر خاڵی دیاریکراو. بێ لەمانەش، ئێمە دەبێ وەك خەڵکی ئاسایی بدوێین. من هیچ حەزم بە خۆ بەزیرەك نیشاندان نییە. هەموو وتەی من، وەك گوندنشینێکی ئاسایی و ساکار ئەمەیەکە:"ئێمە سەربەخۆییمان دەوێ"."

کاتێ کە گاندی بیری ساتیاگراهایی لە هزردا لێك دەدایەوە، بیری لای خەڵکی"ئاسایی" بوو، بەشێوەیەك کە وزەی ساتیاگراها بگاتە دەست هەر ژن و پیاوێکی ئاسایی. ساتیاگراهایی بۆ فێربوون پێویستی بە فێرکەری تایبەت یاخود بڕوانامەی خوێندنی بەرز نییە، چونکە پایەکانی لەسەر سەرەکیترینی یاساکانی سروشتی مرۆڤایەتی واتە عەشق بنیاد نراوە. گاندی بەوپەڕی دڵنیاییەوە

65- G.D.Birla

رایدەگەیەنێ کە هەموومان توانای بەکارهێنانی ساتیاگراهامان لە دەروونی خۆماندا هەیە، بەڵام شێوەی ئازادکردنی وزە"بەرگری لێنەکراو"ەکەی نازانین.

"من تەلیسمێك دەدەمە ئێوە؟ هەرکاتێ دوودڵی و گومان زاڵ بوو بەسەرتاندا یاخود کاتێ تووشی'خۆبەگەورەزانین' بوون ئەم رێگەچارانەی خوارەوە بەکار بهێنن: روخساری بێچارەترین و داماوترین کەس کە تا ئێستا بینیوتانە بهێننەوە یادی خۆتان و لە خۆتان بپرسن ئەو کردەوەیەی کە لەبارەی ئەنجامدان یا ئەنجام نەدانییەوە تووشی گومان هاتوون، سوودێکی هەیە بۆ ئەو کەسە یان نا؟ ئایا ئەو کارەی کە ئەنجامی دەدەن قازانجێکی تیایە بۆ ئەو؟ ئایا کردەوەکەی ئێوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو ببێتە فەرمانڕەوای ژیان و چارەنووسی خۆی؟ بەدەربڕینێکی دیکە، ئایا ئەو کارەی کە پێی هەڵدەسن دەبێتە هۆی... سەربەخۆیی ملیۆنەها هاوولاتی برسیی ئێوە و ئەوانەش کە تووشی هەژاری دەروونی بوونە؟ گەر لەم جۆرە پرسیارانە لە خۆتان بکەن، دەبینن کە گومانەکان و'خود'ەکەی ئێوە وردە وردە لەناو دەچێت."

ساتیاگراها بۆ تاك بە تاکی کۆمەڵگا واتای جیاوازی هەیە و گاندیش ئەم دەستەواژەیەی لە واتایەکی بەرفراواندا دەخستە کار، گەر ساتیاگراها بەسەر دانەرەکانیدا دابەش بکەین، بۆمان روون دەبێتەوە کە، نە بزووتنەوەیەکە بۆ وەدەستهێنانی سەربەخۆیی و نە پەیڕەوێکە بۆ چالاکییە سیاسییەکان، هەرچەندە لە چەند شوێنی جیاوازدا هەر دوو واتاکەی هەیە. ساتیاگراها بە زمانێکی ساکار، هێزی ناخ-رۆح-ە؟ سەرچاوەیەکی بەهێز و کارای وزەیە کە هەموان هەیانە، بەڵام ژمارەیەکی کەم لە بوونی ئاگادارن. گاندی لەساڵی ١٩٠٨دا کاتێ کە لە ئەفریقیای باشور دەژیا دەستەواژەی"ساتیاگراها"ی بەهۆشیارییەوە دانا. ئەم دەستەواژەیە لەهزری گاندیدا بەرێکی بەواتای "وزە" بوو و دەیویست لە بۆ پێناسە و باس لێوەکردنی چەند دەستەواژەیەکی ورد بدۆزێتەوە. مەبەستی ئەو،





جیاکردنەوەی ئەم دەستەواژەیە بوو لە دەستەواژەی"بەرگری نەرێنیی". گاندی لە راپۆرتێکدا لەمەڕ جەنگەکانی ئەفریقیای باشوور وەها پێناسەی ساتیاگراها دەکات:" حەقیقەت- ساتیا- تەواوکەرەکەی بریتییە لە عەشق و پایداری(گراها) کە عەشق پێکی دەهێنێ؟ کەواتە دەتوانرێت بە هاوواتای(وزە)دابنرێت. لەم روانگەیەوە من بزووتنەوەی گەلی هیندستانم ناونا"ساتیاگراها"، ئەو وزەیەی کە بە لێکدانی حەقیقەت و عەشق یاخود نەبوونی توندوتیژی، لەدایك دەبێ..."

ساتیاگراها وشەیەکی روونە و بەڕوونی کرۆکی ئەندێشەی گاندی نمایش دەکا. ئەم هێزە لە بەربەرەکانێیەکانی گاندیدا لە ئەفریقیای باشور لە کۆتاییەکانی سەدەی١٩ و سەرەتاکانی سەدەی٢٠ و هەروەها لەخەباتی بەرامبەر بە دەسەڵاتی ئینگلیز بەدرێژایی جەنگی جیهانیی دووهەم، کەوتۆتە بواری کردەنییەوە. بەدرێژای ئەو سەردەمە ساتیاگراها لە چەندین فۆرمی جیاوازدا دەرکەوت، لەوانە: رێپێوان، مانگرتن، رۆژوو، ئابلۆقە و هەرەوەزی نەکردن، بەڵام هەمیشە لە چاوی گاندیدا وەك هێزێك یا وزەیەك مایەوە، ئەو هێزەی کە ئەنجامی پەیوەندی نێوان هەوڵدان بۆ گەڕان لە دووی حەقیقەت لەلایەك و پابەندبوونێکی بێ چەند و چون بەرامبەر بە نەبوونی توندوتیژی بوو لە لایەکی دیکەوە هاتەکایەوە.

واتای دروستی وشەی ساتیا یا حەقیقەت ئەمەیە:"ئەوشتەی کە هەیە"، واتە ئەوشتەی کە هەرگیز ناگۆڕێ و هەمیشە و بەردەوام و لەهەر بارودۆخێکدا دەمێنێ. بەلای گاندییەوە یەکسان بوو بە(خودا)، تا ئەو جێگایەی کە بێ پەردە دەیگوت:"حەقیقەت خودایە" بەڵام خێرا دوای ئەوە دەیگوت:"تەنها خودا ئاگاداری حەقیقەتی رەهایە و ئێمە تەنها توانای گەڕان و بەدواداچوونی حەقیقەتی رێژەییمان هەیە." لەگەڵ ئەمەشدا لەسەر بنەمای بیروبڕواکانی گاندی،

ئەگەر بەپاکی و بەدەر لە هەر بەرژەوەندییەك گەڕان بە دوای حەقیقەت بکەینە پیشەی خۆمان، هەرگیز زیانمان پێ ناکەوێ.

"...*ئەوشتەی کە لە چاوی کەسێکدا حەقیقەتە، زۆر جار لە چاوی کەسێکی دیکەدا وانییە، بەڵام ئەو کەسەی کە بەدوایدا دەگەڕێ نابێ لەم بارەوە نیگەران بێت. گەر هەوڵی راستگۆیانە لە ئارادا بێت بۆی روون دەبێتەوە کە ئەوشتەی وەك چەند حەقیقەتێکی جیاواز خۆی نیشان داوە، وەك گەڵاکانی درەختێ وایە کە تەنیا لە روخساردا لێك جیاوازن... حەقیقەت ناوی دروستی خودایە. کەواتە نەك هەر گرفتێ لەوەدا نییە کە هەر کەسێ لە ژێر رووناکی دیدی خۆیەوە بگەڕێ بەدوای حەقیقەتدا، بەڵکو وەها کارێ ئەرکی سەرشانییەتی. بەم شێوەیە ئەگەر لە رێگەی گەڕان بەدوای حەقیقەتدا هەڵەیەکی لێ بوەشێتەوە، هەڵەکە خۆبەخۆ چارەسەر دەبێ و رێگەی راست دەگرێتەبەر، چونکە گەڕان بە دوای حەقیقەت پێویستی بە "تاپاس"*[٦٦] *یا، خۆڕاگری ئیرادیی سەختیی و ئازار-ە، هەندێ جار تا سەر ئاستی مردن- . تەنانەت هێمایەکی بچوکیش لە خۆویستی جێگەی نابێتەوە تیایدا. لەوەها گەڕانێکی بێ دوودڵیدا، ونبوون یا بەگومان بوون لە رێگەدا زۆر ناخایەنێ.*"

پێناسەی فەرهەنگیی "گراها" بریتییە لە:" جەختکردنەوە، خواستێکی سەرسەختانە و سەرسەختی." بێگومان گاندی دەستەواژەی "ساتیاگراها"ی بەوپەڕی وردبینی و گومانێکی زۆرەوە هەڵبژاردبوو. ئەم دەستەواژەیە بۆ ئەو، بەواتای پابەندییەکی قورس و سەرسەختانە بوو لە ژێر کاریگەری هەر هەلومەرجێکدا؟ ساتیاگراها لە روانگەی ئەوەوە، ئیرادەیەکی موحکەم بوو کە لە رێگەی گەڕان و بەدواداچووندا دەخرێتە کار، ئەو ئیرادەیەی وزە دەبەخشێتە ئەو بەدواداچوون و گەڕانە.

66- Tapas





بەڵام حەقیقەتی پەتی بەس نییە. گاندی ئاگاداری خووی مرۆڤ بوو و دەیزانی کە حەقیقەت بەتەنها دەتوانێ ببێتە رەگەزێکی "نارەوشتییانە". ئەو دەیگوت:"لەم کاتەدا هەریەك لە ئێمە بەبێ پەنابردنە بەر کەمترین خۆگرتنەوەی کەسیی(شخصی)، بانگەشەکاری رێبواری رێگەی حەقیقەتین و هەر بەم هۆیەوەیە کە لە جیهانی ئاڵۆزی ئێستاماندا تا ئەم رادەیە ناڕاستی و تاریکایی دەبینرێت."

ئەو هۆکارە کە دەتوانێ گەڕان بە دوای حەقیقەت بکاتە ناپاك یا "نارەوشتییانە"، هەستی خۆویستیی مرۆڤە. ئەو دەرمانەی کە گاندی دەینوێنێ، کەمکردنەوەی(سیستماتیك)بیانەی(خودسەنتەری)یە. هەمان ئەو شتەی کە ئەو لەژێر ناونیشانی یاسای ساکاری"خۆتان تا نزمترین ئاست دابەزێنن" دەریدەبڕێ. ئەم کەمبوونەوەیەی خواستە تایبەتییەکان، هەمان ئەو یاسایانەی سەرەوەیە کە ئەو باسی لێوە دەکات و بەبێ ئەو، گەڕان بەدوای حەقیقەت دەتوانێ ببێتە هۆی"خۆبەراست زانین"، خۆبەگەورەبینین و تەنانەت ستەمکارییش.

"*قۆناغێك دادێ کە تاك بەرەنگاری لێنەکراو و کاریگەری کردەوەکانی خێرا و گشتگیر دەبێ. ئەم بارە کاتێ بەدیار دەکەوێ کە تاك خۆیی تا سەر نزمترین ئاست دابەزاندبێ.*"

خۆویستی، رێگەی بەردەم دەربازکردنی وزەی دەروونیی مەزنی ساتیاگراها دەگرێ و پاککردنەوەی ئەو رێگەیە دەبێتە هۆی ئازادکردنی ئەم وزەیە. دەتوانرێ ئەم هێزە لەگەڵ زەوقی هونەرمەنداندا بەراورد بکرێ، ئەوانیش هەندێ جار وەها رستەیەك بەسەر زاردا دێنن:"خۆم لەسەر رێگەی خۆم لابرد." گاندی ناوی"وزە-هێز-ی رۆح"ی لێدەنێ و دەڵێ:" ساتیاگراها هێزی رۆحە، نە کەم و نە زۆر." گاندی بۆ وشەی"هێز" چەمکە باوەکەیی مەبەست نەبوو، بەڵکو مەبەستی واتای وردبینانەی وشەی هێز بوو. ئەو لەوباوەڕەدا بوو-ژیانیشی

ئەمەی نیشاندا -کە لەژێر کاریگەری هەر هەلومەرجێکدا، هەر ژن و پیاوێ خاوەنی هێزێکی مەزنە کە دەبێتە هۆی ئەوەی کاریگەریی کردەوەکانی خێرا و گشتگیر و بەرەنگاری لێنەکراو بێت. هیچکات بەپەنابردنە بەر زۆر بەسەر رکابەرەکەیدا زاڵ نابیێ، بەڵکو سەرئەنجام بە رازیبوونی خۆی، بەرەنگارییەکەی ئەو دەتوێنێتەوە و لەناوی دەبا. ناونانی ئەم هێزە لە ژێر ناونیشانی"بەرەنگاربونەوەی نەرێنی"، هێمای نادیدەگرتنی هێزی چالاك و ئەرێنییەتی، رێك وەك ئەوەی کە رووناکی ناو بنێیت"نەبوونی تاریکی"، نیشانی دەدا کە تیشك-مان بەواتای نەبوونی شتێکی دی داناوە؟ بەم شێوەیە خۆمان گێل کردووە لەو راستییە کە تیشك یاخود رووناکایی بۆخۆی، شێوەیەکە لە هێز و ئەگەر بەدروستی هەستی پیێ بکەی و تێی بگەی، دەتوانیێ شارەکان رووناك بکاتەوە. ساتیاگراها دروست بەم شێوەیەیە، لێرەشدا هێزێکی مەزن شاراوەیە کە لە پشت بێئاگایی مرۆڤ و وشە لاوازەکانی زمانەوە شاردراوەتەوە، بەڵام وەك گاندی دەیگوت گەر بەدروستی تێی بگەی دەتوانیێ سەختترین کێشەکانی مرۆڤ چارە بکات. هەر بەو جۆرەی کە تیشك لە(لەیزەر)دا کۆدەبێتەوە و بەهێز دەبیێ، هێزی شاراوەی نێو ناخی مرۆڤیش بەهۆی خۆگرتنەوەی تاك-ی و خۆپارێزییەوە، بەرەنگاری لێنەکراو دەبێت؟ ئەوکاتەی کە"خۆیی تا نزمترین ئاست دابەزاندبیێ". هەوڵی گاندی ئەمە بوو کە بەنمایشکردنی ژیانی خۆی، مرۆڤەکان فێر بکات کە ئەگەر خود لە خواست و حەزە تایبەتییەکان دەرباز بکەن، دەبنە هۆ، یاخود ئامێرێك، بۆ ئاشکراکردنی ئەم هێزە و بەکارهێنانی بۆ پاککردنەوەی هەر جۆرە دژایەتی و جیاوازییەك. لەگەڵ ئەمەشدا بیێ پەردە دەیگوت کە ئەم هێزە تەنها ژمارەیەکی تایبەتی لە خەڵك نین کە خاوەنی بن، بەڵکو هەموو کەسیێ خاوەنی شێوە شاراوەکەیەتی:





*"[ساتیاگراها] هێزێکە کە جگە لە کۆمەڵگاکان، یەك بەیەکی تاکەکانیش خاوەنین و هەیانە. هەم لە کێشە تایبەتییەکان و هەم لەکێشە سیاسییەکان دەتوانریێ پەنای وەبەر ببردرێت، هەر ئەمەی کە دەتوانریێ لە کێشە جیهانییەکاندا بەکار بهێنریێ هێمای هەمیشەیی بوون و شکست نەهێنانییەتی. بۆ کەڵك وەرگرتن لە ساتیاگراها هیچ جیاوازییەك لە نێوان ژن و پیاو و منداڵدا نییە."*

# ئەهیمسا

لەروانگەی گاندییەوە ئەهیمسا یا ناتوندوتیژی، بەشکۆترین جیلوەی حەقیقەت یا بەدەربڕینێکی وردتر، ڕێگەیەکە کە کۆتاییەکەی حەقیقەت بوو.

*"ئەهیمسا و حەقیقەت وا بەیەکدا چوون کە پراکتیکییانە ناتوانرێ لێك جیابکرێنەوە؟ ڕێك وەك دوو رووی یەك سکە، یا تەنانەت وەك تەنێکی بازنەیی کە هیچ هێما و نیشانێکی لەسەر هەڵ نەکۆڵرابێت و ناتوانرێ بوترێت کە کام لا ڕوویەتی و کام لا پشتییەتی، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەهیمسا هۆکارە و، حەقیقەت ئامانجە."*

ئەهیمسا بونیادی سەرەتایی و پایەی راگری ساتیاگراهایە، "بچووکترین بەش"ێ کە ساتیاگراها پێیەوە پابەندە، دوایین سەنگی مەحەکێکە کە دەتوانرێ بەهای ساتیاگراهای پێ بپێوی.

لەنێوچیرۆکە کۆنە زانستییەکانی هیندستاندا چیرۆکێك هەیە دەربارەی(راهیب)[٦٧]، یێکی پیری هیندۆس کە لە قەراغی روبارێك بە بێدەنگی دانیشتبوو ومانترامی خۆیی دەوتەوە لەسەر درەختێ لە نزیکییەوە دووپشکێ دەڕۆی، لەناکاو لەسەر چڵەدارەکەوە کەوتە ناو روبارەکە، هەر هێندەی کە راهیبەکە دانەوییەوەو دوپشکەکەی دەرهێنا کە لەئاوەکەدا پەلەقاژێی دەکرد، دوپشکەکە گەستی. راهیبەکە گرنگی پێ نەدا و دەستی کرد بە وتنەوەی مانترامەکەی خۆی، پاش کەمێ دوپشکەکە دیسانەوە کەوتەوە ناو رووبارەکە و دیسانەوە ڕاهیبەکە وەك جاری پێشوو لە ئاوەکە دەریهێناو خستییە سەر چڵەدارێك و دیسانەوە دووپشکەکە

٦٧- بەزانای ئایینیی هەندێ لە ئایینەکانی وەك: هندۆس و یەهودی و... دەگوترێت.





گەستی. ئەم دیمەنە چەندین جار دووبارە بوویەوە و هەرجارەی کە راهیبەکە دوپشکەکەی دەرباز دەکرد کە دووپشکەکە دەستی دەگەزێ.

لەم کاتەدا گوندنشینێکی بێئاگا لە چۆنییەتی بیرکردنەوە و شێوەی ژیانی پیاوە ئایینییە پیرۆزەکان کە بۆ ئاوبردن هاتبووە کەنار ڕوبارەکە، بەدیتنی ڕووداوەکە کۆنترۆڵی خۆی لەدەست دا و بەکەمێ تووڕەییەوە وتی:"سوامیجی[٦٨]، من بینیم کە بەڕێزتان چەندین جار ئەو دوپشکە بێ ئەقڵەتان دەرباز کرد، بەڵام هەموو جارێ بەڕێزتانی گەست. بۆچی واز لەو گیاندارە ریسوایە ناهێنی؟

ڕاهیبەکە وەڵامی دایەوە:"برا، خۆ ئەم گیانەوەرە بەدەستی خۆی نییە، گەستن سروشتییەتی."

گوندنشینەکە وتی:"وایە، بەڵام تۆ کە ئەمە دەزانی بۆچی دەڕۆی بەلایا؟"

ڕاهیبەکە وەڵامی دایەوە:"ئای برا، خۆ منیش بەدەست خۆم نییە، من مرۆڤم، رزگارکردن سروشتی منە.

زۆرجار"ئەهیمسا" بە"ناتوندوتیژی" وەردەگێڕن، بەڵام هەروەك بینیمان واتاکەی فراوانترە لە ناتوندوتیژی. ریشەی دەستەواژەی ئەهیمسا بریتییە لە وشەی سانسکریتی"هن" بەواتای کوشتن و شێوەی"هیمس" تێیدا بەواتای "ئارەزومەندی کوشتن"ە؟ پێشگری"ئا"ش، پێشگری نەرێیە. کەواتە واتای وشە بە وشەی پەیڤی ئەهیمسا"نەبوونی حەزی کوشتن"ە و ئەمە لەوانەبێ سەرەکیترین بابەتێکە کە بنچینە رەوشتییەکانی ئایینەکانی هیندۆس و بودایزم و جینییزم لە سەری راوەستاون و پایەدارن لەسەری. لە کتێبی"مەنۆسمریتی"[٦٩]، کە کتێبی مەزنی ئایینی هندۆسییە، وەها رستەیەك هاتووە:"ahims paramo dharma" واتە ئەهیمسا گەورەترین یاسایە. گاندیش هەر بە جەوهەری بوونی مرۆڤایەتی دادەنێ.

٦٨- swamiji:مامۆستای ئایینی هیندۆسی.

69- Mana Smriti

*"ناتوندوتیژی یاسای مرۆڤە، هەر وەك چۆن توندوتیژی و تورەیی یاسای درندەکانە. رۆحی درندەکان بێ دەنگکراو و خەوتووە؟ بێجگە لە هێزی جەستەیی یاسایەکی دی ناناسێ. بەلام(شەرافەت)ی مرۆڤ وا پێویست دەکا کە پەیرەوی لە یاسایەکی مەزن بکات، یاسای هێزی رۆح..."*

دەستەواژەی"ناتوندوتیژی"، چەمکێکی تاڕادەیەك نەرێیی و کارلێکراو بەدیار دەخا، لەکاتێکدا کە وشەی"ئەهیمسا" لەسانسکریتیدا دەرخەری جۆرێکە لە دۆخی نەمریی هزر کە دەبێتە هۆی ئازادبوونی هێز، گاندی دەیوت:"*سەرچاوەی هێز توانستی جەستەیی نییە، بەڵکو ئیرادەیەکی نەلەرزاوە کە هێز دروست دەکات.*" ئەو خۆی هێزی لە ئیرادەیدا بینییەوە و داواشی لەخەڵکی تر دەکرد کە لەئیرادەیاندا بەدوای هێزدا بگەڕێن. ئەم هێزە دەروونییە کە لەقولاییەکانی ویژدانی مرۆڤدا خۆی حەشار داوە، بەڕەچاوکردنی تەواوی ئەهیمسا پەروەردە دەبێ. لەکاتێکدا توندوتیژی، کە دەبێتە رێگری ئەم هێزە دەروونییە و رێگری ئازادبونییەتی، شتێ جگە لە کاولکاری ناهێنێتە کایەوە؟ گەر بەدروستی ئەهیمسا دەرك بکرێت شکست نەخواردوو و پایدار دەبێ. گاندی دەیوت:" *ساتیا* (*حەقیقەت*)، *تێکەڵ لەگەڵ ئەهیمسا* (*ناتوندوتیژی*) *دەتوانێ جیهان بخاتە ژێر دەسەلاتی ئێوە.*" کاتێ گاندی باس لە ئەهیمسا دەکا وەك یاسایەك، دەبێ وتەکەی بەواتای ورد و دروستی وشە لێك بدەینەوە. لەڕاستیدا ئەهیمسا لە روانگەی ئەوەوە یاسایەکە وەك یاسای کێشکردن، کە دەتوانێ لە ژیانی رۆژانەی مرووڤدا خۆی بنوێنێ. تەنانەت گاندی وەك زانستێ کردییە پیشەی خۆی و رۆژێك لە رۆژان گوتی:" *من ناتوندوتیژی و کەرەستەکانیم پتر لە ٥٠ساڵ بێ وەستان و بە وردییەکی زانستییانەوە خستۆتەکار، چ لە کێشە تایبەتییەکان و چ لەکۆمەڵدا و چ لە کێشە سیاسی و ئابوورییەکاندا، تەنانەت یەك بابەتیشیان رووبەرووی شکست نەبوویەوە.*" گاندی هیچ حەزی بە شتێ کەمتر لە بەکارهێنانی هەمەلایەنە نەبوو، چونکە ئەهیمسا لە بنچینە ئایینی و سیاسییەکان و





لە ژیانی تایبەتیشیدا خولقا و هەر لەوانەشدا دەخرایەکار. بەهای ئەهیمسا تەنها لەکاتی کارپێکردنی و ئەویش لەنێو دژایەتیکەراندا و لەگەڵ بوونی بەربەستەکاندا ئاشکرا دەبێ. گاندی بەردەوام بەوانەی رەخنەیان لە شێوازی ساتیاگراهی هەبوو دەگوتەوە، لەبری هەڵکۆڵین و شیکارکردنی تیۆرەکان، ئەنجامە پراکتیکییەکانی ئەم تیۆرانە لەبەرچاو بگرن.

*"ناتوندوتیژی، رەوشتێکی جوانی ئەوانە نییە کە گۆشەنشینن و بیانەوێت بە پەنابردنە بەر ئەم، ئارامی و رزگاری وەدەست بهێنن، بەڵکو یاسایەکە کە دەبێ لە کۆمەڵدا بخرێتە کار. بەکارهێنانی ناتوندوتیژی لە بوارە دنیاییەکاندا نیشانەی هەستکردنە بە بەها راستەقینەکەی. گەر وەها کارێ ئەنجام بدەین فریشتەکانمان هێناوەتە سەر گۆی زەوی... لەم رووەوە من رام وایە کە سنووردارکردنی ناتوندوتیژی وەك ئامرازێ بۆ ئەشکەوت نیشینان( گۆشەنشیینان) بەمەبەستی وەدەستهێنانی لێهاتوویی و گەیشتن بە پلەوپایەیەکی شایستە لە دونیادا شتێکی نادروستە. رەوشت جوانی گەر لە هەر هەنگاوێکی ژیاندا لە رێگەی گەیشتن بە ئامانجەکان نەخرێتەکار، بێ کەڵك دەبێ."*

پابەندی گاندی بە ناتوندوتیژی لە ئەزموونەکانییەوە سەرچاوەی گرتبوو، بەوەی کە چارەسەری هەمیشەیی جیاوازییەکان بە پەنابردنە بەر ئەم شێوازە نەبێ ناکرێ. ئەو وای بۆ دەچوو کە توندوتیژی تەنها بانگەشەکاری چارەسەری گرفتەکانە و جگە لە چاندنی تۆوی دووبەرەکی و دوژمنایەتی، بەرهەمێکی دیکەی نییە و لەکۆتایدا هەلومەرجەکە لەوەی کە هەیە خراپتر دەکات.

بۆ دەرککردنی ئەهیمسا، پێویستە بیکەیتە پیشەی خۆت. لە روانگەی گاندییەوە تەنها دەربڕینێکی پاکی باوەڕ هەبوون بە ئەهیمسا و تەنانەت نووسینی کتێبێکیش لەبارەیەوە بەس نییە. گەر نەبوونی توندوتیژی لە پەیوەندییە تایبەتییەکانماندا لەگەڵ خەڵکی دی وەکار نەخەین، زۆر بەسەختی تووشی هەڵە هاتووین. وەك چاکەکاری دەبێ هەر لەماڵەوە دەست بە پرۆسەی ناتوندوتیژی بکرێت.

بەهیچ شێوەیەك بەپراكتیكی كردنی بنچینەكانی ناتوندوتیژی بەئاسانی ناكرێ و گاندیش وەها بانگەشەیەك ناكا. ناتوندوتیژی راستەقینە وەك شێوازێك یا كۆمەڵە بنچینەیەك پێویستی بەچاودێریی بەردەوام لەسەر گشت لایەنەكانی ژیان هەیە، چونكە سەرباری ئاكار، گوفتار و بیركردنەوەش دەگرێتەوە.

"*ئابێ وا بیربكەینەوە كە ئەهیمسا بەرگێكی حازرە و ئامادەی لەبەركردنە. ئازارنەگەیاندن بە بوونەوەرە زیندووەكان بێگومان بەشێكە لە ئەهیمسا، بەڵام بچووكترین رەهەندیەتی، هەر لێكدانەوەیەكی شەیتانییانە، پەلەكردنی بێ هۆكار و درۆ، قین و بەدخوازی بنچینەی ئەهیمسا لەككەدار دەكات. هۆكارێكی دیكە كە دەبێتە هۆی پێشێلكردنی، خۆ بەخاوەنداركردنی شتێكە كە خەڵكی دی پێویستییەتی.*"

دەتوانرێ بەروونی ئەوە ببینرێ كە بەكارهێنانی ئەهیمسا چ گرنگییەكی هەیە. گەر بەو شێوەیە كە پێویستە لەگەڵیدا بژین پێكهاتەی ژیان دەگۆڕێ. مەبەستی گاندی ئامرازێك نییە بۆ خۆشگوزەرانی یاخود كات بەسەربردن، فێربوونی یاسای ئەهیمسا هەندێجار هەموو تەمەنی پێویستە. گاندی باس لە گۆڕینی روخساری جیهان دەكا و بەتەواویش سوورە لەسەر وتەكەی خۆی.

"*ناتوندوتیژی لە شێوەی گەشەسەندووی خۆیدا بەواتای تاوگرتن-سەبر- ێكی هۆشیارانەیە لەبەردەم سەختی- ئازار- دا. واتاكەی لێبووردنێكی ملكەچانە لەبەرامبەر خواستی بەدكاراندا نییە، بەڵكو بانگهێشت كردنی خواستی ستەمكارانە بۆ نەبەرد لە بەرامبەر هێزی رۆحدا. هەر تاكێ كە لەسەر ئەم بنچینەیە بژی، دەتوانێ بەرەنگاریی هەموو هێزی دەسەڵاتدارە ستەمكارەكان بكات بۆئەوەی ناموس و ئایین و رۆحی خۆی بپارێزێ و لە كۆتاییدا زەمینەی روخانی ئەو دەسەڵاتدارانە، یا گۆڕینی شێوازی حكومەتەكەیان بهێنێتە كایەوە.*"





ئەهیمسا هاوواتای خۆبەدەستەوەدان نییە، ئەم جۆرە لێكدانەوەیە خراپ تێگەیشتنێكی باو و بەربڵاوە. ئەهیمسا بە رووگەشی و هەستی هاودەردییەوە و لە هەمانكاتدا بە بەرەو پیرچوونێكی پایەدار و قورسەوە، رووبەرووی ركابەرەكەی دەبێتەوە و دڵنیایە كە لە بەرامبەر ركابەرەكەیدا مەیدان چۆڵ ناكا-لایەنی بەرامبەر چەندە بەهێزیش بێت-، ئەهیمسا بەپێچەوانەی توندوتیژییەوە گشتگیر و لەسەرخۆیە، هێندە كە هەندێ جار ناتوانرێ كاریگەرییەكەی ببینرێ، هێمنیی ئەهیمسا نەك هەر كاریگەرییەكەی لەناو نابات، بەڵكو دەبێتە هۆی ئەوەی خۆڕاگری لەبەرامبەریدا سەختتر بێت.

"*ناتوندوتیژی وەك(رادێوم)*[٧٠]*، كار دەكات. بەشێكی زۆر كەمی بكرێتە ناو غودەیەكی شێرپەنجەیی، بەردەوام و بێ وەستان و بێدەنگ درێژە بە كاریگەریی خۆی دەدا و تا لەكۆتاییدا گشت بەشە نەخۆشەكە چاك دەكاتەوە و دەیكاتە بەشێكی ساغ. هەر بەم شێوەیە تەنانەت كەمێ ناتوندوتیژی راستەقینە بێدەنگ و نەرم و بەشاراوەیی درێژە بە كاری خۆی دەدا و لە كۆتاییدا گشت كۆمەڵگا دەگرێتەوە.*"

٧٠- رەگەز یا ماددەیەكە، كە زۆر كەم و بەنرخە و ساڵی ١٨٩٨ لەلایەن (مادام كۆری) و هاوسەرەكەی لە-كان-ی یۆرانیۆمدا دۆزرایەوە. تەنێكی سپی و بریقەدارە كە شێوەی لە(خوێ)ی كوتراو دەچێ، لە تاریكاییدا وەك گڵۆپ یا چرا روناكایی دەداتەوە و دەبریقێتەوە و گەرمایی دروست دەكا، بەهاكەی هەزار ئەوەندەی بەهای زێڕە.

# ساتیاگراها

## ئەفریقیای باشور، ساڵی ١٩٠٦

*"ئەفریقیای باشوور نموونەیەکە لە شارستانییەتی ڕۆژئاوا، لەکاتێکدا هیندستان بەناوەندی کولتوری ڕۆژهەڵات دادەنرێت. بیرمەندانی ئەوەی ئێستا وای بۆدەچن کە ئەم دوو ژیارە ناتوانن لە پەنای یەکدیدا بەئارامی دانیشن. گەر ئەو نەتەوانەی کە، رووی(نموونەی) ئەم دوو کولتورە جیاوازەن بگەن بەیەك، تەنانەت وەك چەند کۆمەڵەیەکی بچووکیش، ئاکامێکی نابێ جگە لە تەقینەوە. ڕۆژاوا دژی ساکارییە، لە کاتێکدا ڕۆژهەڵاتییەکان گرنگی تایبەتیان بۆ ئەم بنەما سەرەکییە داناوە. ئێستاکە چۆن دەتوانرێ ئەم دوو دیدگا دژبەیەکە لەگەڵ یەك ئاشت بکرێنەوە؟ ... بۆی هەیە شارستانییەتی ڕۆژاوا باش بێت، لەوانەشە وانەبێت. بەڵام هەرچۆنێك بێت ڕۆژاواییەکان پێیەوە پابەندن و بەهۆیەوە چەندین خوێنرێژگە-یان خوڵقاندووە و ئیدی زۆر درەنگە لە بیری ڕێگەیەکی نوێدا بن بۆ خۆیان. بەم جۆرە ئەو کێشانەی کە لە هیندستاندا هاتۆتە کایەوە، ناتوانرێ بخرێتە پاڵ ئێرەیی بردنە چینایەتییەکان، یاخود کینە رەگەزپەرستییەکان. گرفتەکە، تەنها لە هەوڵدان بۆ پاراستنی شارستانییەتییەکەیاندا خۆی حەشارداوە...*

*هیندییەکانی دانیشتووی ئەفریقیای باشور بەهۆی سادەیی، خۆڕاگری و سەبر، سووربوون و خۆگرتنەوە و دیدگای ئەودیوسروشتییان(میتافیزیکی)، بێ سۆزی و نامیهرەبانی بەرامبەریان دەنوێنرا. ڕۆژاواییەکان بێ شەرم و خۆبەزلزان و خۆڕانەگر، نوقمی ئەو خواستە مادییانەی کە ڕۆژبەڕۆژ لە زیادبووندان و حەزکردوو بە شادی و*

*کەیف، ئارەزوومەندی کاری جەستەیی و دەست بڵاوون. لەم رووەوەیە کە ترسیان لە نیشتەجێ بوونی هەزاران رۆژهەڵاتی لە ئەفریقیای باشوردا هەیە کە جێ پێیان پێ لێژ بکەن. رۆژئاواییەکانی دانیشتووی ئەفریقیای باشور مەبەستی خۆکوژییان نییە، رابەرەکانیشیان روخسەت نادەن کە بکەونە ئەم جۆرە تەنگ و چەڵەمانەوە."*

ساتیاگراها شێوازێکی پراکتیکییە لە بۆ چارەسەرکردنی جیاوازییەکان. وەك باوە جیاوازی یاخود دژایەتی نێوان دوو لایەن تەنها بە رازیبوونی لایەنێك بە سەرکەوتن-زاڵبوون- بەسەر لایەنەکەی دی"چارەسەر" دەبێ؟ هەمیشە بۆچوون وایە کە، یەکێ لە لایەنە بەگژ یەکدا چووەکان، تەنها بە شکستهێنانی لایەنی بەرامبەر سەرکەوتن وەدەست دێنێ. لەم دۆخەدا دەتوانی سەرکەوتن بە پەنابردنە بەر لۆژێك یا هاندانی لایەنی بەرامبەر یاخود تۆقاندن و زۆر وەدەست بێنی؟ بەڵام لە هەموو ئەم بارانەدا گریمانی سەرەکی لە جێی خۆیدایە، ئەگەر بڕیار وایە کە براوەیەك لە ئارادابێت، دەبێ دۆڕاوێکیش لە ئارادا بێت؟ تەنانەت ئاشتبوونەوەش هەر لەسەر بنچینەی ئەم گریمانە ئەنجام دەدرێ، هەرچی زیاتر سوودمەندبوونە بەنرخی زەرەرمەندبوونی لایەنی بەرامبەر و تەنها کاتێ پەنا دەبرێتە بەر ئاشتبوونەوە کە هەلومەرج وابخوازێ.

ساتیاگراها هێڵێکی چەوت-هەڵە- بەسەر ئەم گریمانەدا دەهێنێ. ئامانجی ساتیاگراها لەبری ئەوەی زاڵبوون بێت بەسەر رکابەر و بانگەشەکارییەکانیدا، بریتییە لە، لەبن هێنانی ریشەی جیاوازییەکان. گاندی بەوپەڕی کورتییەوە وەها باس لەم چەمکە دەکات:"ساتیاگراها لەدووی لە ناوبردنی دووژمنایەتییە نەك لەناوبردنی دووژمن." ئەمە خاڵێکی چارەنووسسازە، چونکە خێرا هێڵێك لە نێوان ساتیاگراها و باقی شێوازەکانی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانی تر دەکێشێت کە ئامانجێکی تریان نییە جگە لە وەدەستهێنانی ئامانجە سوودخوازانەکان. ئامانجی ساتیاگراها بریتی نییە لە قەرەبووکردنەوەی ناڕەزاییەکان و لابردنی کەم و کورتییەکان، ئەم بابەتە لە بەرامبەر ئامانجە سەرەکییەکاندا لاوەکی و بێ بایەخن و بتەوێ و نەتەوێ وەدەست دێن؟





ئامانجی کۆتایی ساتیاگراها لابردنی ریشە بنەڕەتییەکانی دژایەتی و جیاوازییەکانە. واتە لابردنی دوژمنایەتی و بێ متمانەیی ساتیاگراها لەپێناو چارەسەرکردنی جیاوازییەکان، بانگهێشتی رکابەر دەکات بۆ رازیبوون لەسەر ئەو مەرجانەی کە سەرچاوەکەی نەبوونی توندوتیژییە، ئەو مەرجانەی کە بەرژەوەندی هەردوولایان مسۆگەر دەکات. ساتیاگراها خەریکی ئەوەیە رکابەرەکەی تێبگەیەنێ و رازیی بکات کە ئەو- یاخود وردبینانەتر بڵێین ئێمە، لە هەماهەنگی پتر سوودمەندتر دەبین، تا لە نەگونجان و دژایەتی. هێنانەکایەی گۆڕانکارییەکی لەوجۆرە لە رکابەردا، بەردەوام ئامانجی سەرەکی ساتیاگراهایە، هەرچەند شێوازە پراکتیکییەکانی بەپێی هەلومەرجە جیاوازەکان دەشێ گۆڕانکارییان بەسەردابێت.

ساتیاگراها بەپێچەوانەی شێوازە توندوتیژ ئامێزەکانەوە چارەسەری کۆتایی جیاوازییەکان بە-لادان، لەناو بردن-ی رکابەر نازانێ؟ بەڵکو بەپێچەوانەوە، دەکۆشێ بۆئەوەی دیدگای ئەو بگۆڕێ و ئەویش بەشداری پێ بکات وەك شەریکێکی خاوەن سوود لەدۆزینەوەی چارەسەر و بەم شێوەیە ئامانجێکی نییە جگە لە"بەرزکردنەوەی هەردوولایەن"، سایتاگراها رکابەرەکەی خۆی بەدوژمنێك نازانێ کە دەبێت سەرکەوێ بەسەریدا، بەڵکو بەشەریکێکی دادەنێ لەپێناو دۆزینەوەی چارەسەرێکی ئابڕومەندانە و لەبری شکست پێهێنان و روخاندنی ئەو، هەوڵدەدات کە بەرەو حەقیقەت ڕایکێشێ و لە هەڵە و تاوانکاری دووری بخاتەوە.

*"ئەم شێوازە لەرووی چییەتییەوە، یەکێك لە بنچینە گرنگەکانی یاخیبوونی ناتوندوتیژییە؟ کەواتە ریشەی لەناخی ئەویندایە. مەبەست لێی تەمێکردنی رکابەر یان ئازار پێگەیاندنی نییە. تەنانەت کاتێ کەخۆمان لەهاوکاریکردنی لایەنی بەرامبەر لادەدەین، دەبێ بەشێوەیەك بین کە بەردەوام هەست بکات ئێمە دۆستی ئەوین، دەبێ هەوڵمان بۆ ئەوە بێ لەگەڵ رەخسانی هەل، بەبەخشینی خزمەتگوزاریی مرۆیی دڵی داگیر بکەین.*

*"بنەمای سەرەکی یاخود پایەی ناتوندوتیژی ئەمەیە کە، ئەگەر شتێ لەسەر تاکێ- کەسێ - بەڕاست دەرچێ، لەمەڕ گشت دانیشتوانی جیهانیش هەر وەهایە. سروشت-خوو-ی هەموو خەڵك یەکسانە، کەواتە ئەو شتەی بۆمن دەرەخسێ بۆ هەموانیش دەرەخسێ."*

ساتیاگراها ڕوانگەیەکی نوێ لە حەقیقەت و ناتوندوتیژی دەخاتە پێش چاو، دڵنیایی گاندی لەمەڕ ئەوەی کە رکابەرەکەمان لەکۆتایدا پەلکێشی ئێمەو هزرەکەمان دەبێت لە بڕوای ئەودا لەسەر بنچینەی ئەوەیە کە، سروشتی حەقیقەت و ویست و بێ هێزی هاوبەش لەهەمووماندا ڕیشەی هەیە. ساتیاگراهی لەو ڕوانگەیەوە کە لەناخی خۆی و رەقیبەکەیدا یەك ڕاستی دەبینێ بڕوای نەلەرزاوی لەسەر ئەم بنچینەیەیە، کە ئەگەر لێبووردەیی و هاودەردی لەڕادە بەدەر بکاتە پیشەی خۆی، رکابەرەکەشی وەها دەکات، ساتیاگراهی هەوڵ دەدات کە دژایەتی بگۆڕێ بەپەیوەندیەك لەسەر بنچینەی ڕێزو متمانەی بەرامبەر و لەبێ متمانەیی و مەرام خراپ بەدووری بخاتەوە. ئەم گۆڕانکارییە لە رکابەردا چ خۆی بیەوێ و چ نەیەوێت ڕوودەدات، ساتیاگراهی سوود لە متمانەو هەستی هاودەردیی خۆی لەبەرامبەر رکابەرەکەی وەردەگرێ و لە کاتی پێویستیشدا لەو ئامادەیی تەحەمولکردنی مەینەتەی کە لەخۆیدا بەدیی دەکات، بەهرە وەردەگرێ بۆ رامکردنی پلەبەپلەی دڵی رکابەرەکەی و چەککردنی.

# ئەفریقیای باشوور، ساڵی ١٩١٤

*"بەم شێوەیە لەپاش هەشت ساڵ خەبات و بەرەنگاری، ڕێکەوتنێکی کاتیمان وەدەستهێنا و سایتاگراها بۆ دوایین جار کەوتە دۆخی هەڵواسراوی... ڕاکێشانی ڕەزامەندی هیندییەکان بۆ ئەم ڕێکەوتنە، کارێکی تا ئەندازەیەك سەخت بوو. کەس حەزی نەدەکرد ئەو تاسە و شەوقەی کە بڵێسەی سەندبوو دامرکێتەوە، پاشان کێ دەیتوانی متمانە بە(ژەنراڵ سمۆتێز) بکات؟ یەکێ لە هاوکارەکانم بۆهێنانەوەبیری کارەساتە ئابڕووبەرەکەی ساڵی ١٩٠٨، وتی:* "جارێك ژەنراڵ سمۆتێز گاڵتەی پێ کردین و هەڵی خەڵەتاندین، کۆمەڵگای هیندییەکانیشی خستۆتە ناو مەینەت و سەختییەکی زۆرەوە، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، بەداخەوە هێشتا وانەی گرنگی متمانەنەکردن پێی، فێرنەبوون. ئەم پیاوە جارێکی دیکە خیانەتتان لێ دەکا و دیسانەوە ناچار دەبن کە بزووتنەوەی ساتیاگراهی لە سەرەتاوە دەست پێ بکەنەوە، بەڵام ئیدی ئەو ڕۆژە کێ گوێ لە تۆ دەگرێ و بە وتەکانت رازی دەبێ؟"...

*"من، خۆم دەمزانی کە لەم جۆرە بەڵگەهێنانەوانە دەخەنەڕوو، بۆیە بەبیستنیان تووشی سەرسوڕمان نەهاتم. گرنگ نییە کە ساتیاگراهییەك چەند جار دەبینێ کە خیانەتی لێ دەکرێ. مادام بەڵگەیەکی سەلمێندراو لەئارادا نییە بۆئەوەی متمانە بە رکابەرەکەت نەکەی، دەبێ متمانەی پێ بکەی. خەم و شادی بۆ ساتیاگراهی هیچ جیاوازییەکی نییە، کەواتە تەنها لەبەر ترس لەخەم و سەختی، لەرێگەی سەرەکی لانادا و بێ هۆکار لە دامێنی بێ متمانەییدا ناتلێتەوە، لەلایەکی ترەوە بەو پشت ئەستوورییەی کە بە هێزی خۆی هەیەتی، گرنگی بە خیانەتکارییەکانی رکابەرەکەی نادا و لەگەڵ بوونی خیانەتە یەك لەدوای یەکەکانیش متمانەی پێ دەکات. ساتیاگراها وا بیر دەکاتەوە کە بەم شێوەیە هێزەکانی ڕاستی بەهێزتر و لە سەرکەوتن نزیکتر دەکاتەوە... نەبوونی متمانە هێمای سستییە و لەساتیاگراهادا شوێنێك بۆ لاوازی و لەئاکامیدا بێ متمانەیی نییە. سروشتی( ئاسایی)یە کە کاتێ مەبەستمان تێکشکاندنی رکابەر نییە، بەڵکو ڕاکێشانی پشتگیریی ئەوە، بێ متمانەییش ئیدی واتای خۆی دەدۆڕێنێ."*





ساتیاگراهایی لەهەوڵی خۆیدا بۆ وەدەستهێنانی پشتگیریی رکابەر، بەهەر شێوەیەکی ڕەخساو لە هەوڵی هاوکاریدایە لەگەڵ ئەو، بۆ دروستکردنی متمانە و ڕێزی بەرامبەر. ئەم شێوازە لە ساتیاگراهادا خاوەنی گرنگییەکی چارەنووسسازە. چونکە هەر لەسەر ئەم متمانەیەیە کە دەزگا-بینا-یەك بنیاد دەنرێ کە لەکۆتایدا هەردوو لایەن تێیدا لەپێناو دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆ جیاوازی-دژایەتی-یەکانیاندا دەنیشن. بەڵام ئامانجی سەرەکیی ساتیاگراها تەنها ڕێگەچارە وەدەستهێنان نییە، بەڵکو ئامانجی مەزنی بریتییە لە هێنانەکایەی پەیوەندییەکی نوێ لەسەر بنچینەی متمانەی بەرامبەر. کەواتە ئەو شتەی کەساتیاگراها لەکۆتایدا بەشوێنیدا دەگرێت، شتێ نییە جگە لە هاوکاری.

*"گەرچی نەبوونی هاوکاری یەکێکە لە، چەکە سەرەکییەکانی بەرهەمی جبەخانەی ساتیاگراها، بەڵام نابێ لەیادی بکەی کە هەر چۆنێك بێت تەنها هۆکارێکە بۆ ڕاکێشانی هاوکاری هەمیشەیی رکابەر لەگەڵ ڕاستی و دادوەری، کەواتە خۆدوورگرتن لە هەبوونی هەرجۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ هێزی بەرامبەر، هەرگیز ئامانجی ساتیاگراها نییە. بەڵکو ئامانجی سەرەکی، گۆڕین و پاڵاوتنی ئەو پەیوەندییەیە."*

ئێستا پرسیار ئەمەیە کە ئەگەر ئامانجی سەرەکی هاندانی رکابەرە بۆ ڕەزامەندبوون لەسەر دیدگاکانی ساتیاگراها، کەواتە هەندێ شێوازی وەك یاخیبوونی مەدەنیانە و مانگرتن و هاوکاری نەکردن، کەی و چۆن بەکاردێن؟ وەڵامی گاندی ئەمەیە: *"کاتێ کەبەڵگەهێنانەوە رێ بەجێگەیەك نابا، ئەم شێوازانە هەلومەرجی خۆڕاگرتنی سەختی بۆ ساتیاگراها دروست دەکەن و ئەمە دوایین و پاکترین چەکێکە کە بەدەست ساتیاگراهاوەیە بۆئەوەی رکابەرەکەی بخاتە سەر رێ."*

## ئەفریقیای باشوور، ساڵی١٩١٣

*"بەدرێژای ئەم ماوەیە، چەند ڕۆژێکی خۆشمان لەبەندیخانەی(ڤۆلکس رۆست)*[٧١] *بەسەربرد، هەموو ڕۆژێك چەندین بەندکراوی نوێ دەهاتن و هەواڵی ڕووداوەکانی دەرەوەی بەندیخانەیان بۆ دەهێنایین. پیرەپیاوێکی٧٥ ساڵ بەناوی(*هارباتسین*) لەنێو ئەم بەندکراوە ساتیاگراهییانەدابوو، ماوەی ڕێکەوتنەکەی هارباتسین بۆکارکردن لە(کان)ێکدا چەندین ساڵ لەمەوپێش بەکۆتاهاتبوو و ئەو لە کرێکارە مانگرتووەکانی کانەکان نەبوو، پاش گرتنی من، هیندییەکان زۆر بەخرۆشتر لەجاران ئارەزوو(نیاز)ی ڕۆشتنیان لە(ناتاڵ)ەوە بۆ(ترانسواڵ) هەبوو، زۆرێك لێیان گیران و هارباتسین یەکێك لەوانەبوو.*

*ڕۆژێك لەبەندیخانەدا لێیم پرسی: ُتۆ لێرە چی دەکەی؟ خۆ من بانگهێشتی بەساڵاچووانی وەك تۆم نەکردبوو کە بچن بەپیر بەندیخانەوە.*'

*هارباتسین وەڵامی دایەوە:* ُدەمتوانی چی بکەم؟ خودی تۆ، هاوسەرەکەت و تەنانەت کوڕەکانیشت لەبەرئێمە چوونەتە بەندیخانە.'

*وتم:ُ بەڵام تۆ توانای سەختییەکانی بەندیخانەت نییە. من وابەباش دەزانم کە لێرە دەرچیت. گەر دەتەوێ با کارەکانی ئازادبوونت بۆ ڕێك خەم؟*'

71- Volksrust





وتی نا، سوپاست دەکەم. من لێرە ناڕۆم. من خۆ تەمەنی خۆمم کردووە، کەواتە چ باشتر کە لە بەندیخانەدا بمرم.'

*نەمدەویست بڕیارە تۆکمەکەی لاواز بکەم، ئەگەریش بمویستبا، توانای وەها کارێکم نەبوو. لە بەرامبەر ئەم عاقڵە نەخوێندەوارەدا سەری ڕێزم دانەواند، پاش ماوەیەك هارباتسین بە ئارەزووی خۆی گەیشت و لە ٥ی کانونی دووەمی١٩١٤ لە بەندیخانەی(*دۆربان*) کۆچی دوایی کرد."*

بیردۆزەی ساتیاگراهای گاندی ڕاستەوخۆ لە ئەزموونەکانی ئەفریقیای باشورەوە وەرگیرابوو، هەرچەندە لە ڕووی چییەتییەوە ڕەهەندێکی ئایدیالیستی هەبوو، بەڵام لەکاتی بەکارهێنانیدا، شیاوی بە پراکتیکردنی ئاست بەرزانەی بەدیار دەکەوت، خودی ئەو، لۆژیك(منطق)ی کردبووە چرای ڕووناکی بەخشی ڕێگەی ژیانی، بەڵام لە هەمان کاتدا دەیزانی کە لۆژیك دڵی مرۆڤ ناکاتە ئامانج و لەو ڕوانگەشەوە کە ساتیاگراها ئامانجێکی جگە لەگۆڕینی رکابەرەکەی نییە دەبێ لە کۆتاییدا ڕێ بە دڵی ببات. لەگەڵ ئەمانەشدا لە سەرەتادا هێز و لۆژیکی رکابەرەکانی بەنیشانە دەگرتەوە. بە درێژایی خەباتی گاندی، لیستێکی دوورودرێژ لە داواکارییەکان و سکالانامەکان، بیرخەرەوە و کۆنفراس و بڕیارنامەکان ئامادەیە و دیارە. "شێوازی باو" یەکەم هەنگاوە کە لە خەباتی ساتیاگراهادا دەهاوێژرێت، بەڵام نەریتەکان و یاسا و حەزە تایبەتییەکان زۆرجار ڕێ بە لۆژیك دەگرن، یا وەك ئەوەی کە لە زۆرێك لە جیاوازییەکاندا بەدیار دەکەوێ، ئەوشتەی کە لەڕوانگەی لایەنێکەوە حەقیقەتە لەڕوانگەی لایەنی بەرامبەرەوە بە شتێکی ناحەقیقی بەدیار دەکەوێ. وەها(بنبەست)[٧٢]ێك بەگشتی نیشانەی گەیشتنە لوتکەی تێهەڵچوونەکانە.

٧٢- بنبەست، بەو کۆڵانە دەوترێ کە لە کۆتاییەکەیدا، ڕێگەی دەرچوونی نەبێ. وە، ك.

*"لە سەرەتای هەنگاوەکانی بەکارهێنانی ساتیاگراها بۆم دەرکەوت کە گەڕان بە دوای حەقیقەتدا بە بەکارهێنانی توندوتیژی لە بەرامبەر رکابەردا شتێکی ناتەبا و نەگونجاوە، لەم ڕێگەیەدا دەبێ بەدڵفراوانی و هەستی هاودەردی، لە هەڵە و تاوان گلی بدەینەوە؟ چونکە ئەو شتەی لە چاوی یەکێکدا حەقیقەتە بۆی هەیە لە دیدی یەکێکی دیدا بە ناڕاست بەدەرکەوێ. دڵفراوانی-لێبووردەیی- شتێ نییە جگە لە خۆڕاگریی خۆبەخشانەی بەردەم سەختی و مەینەت. کەواتە ساتیاگراها بەواتای خستنە سەرتەختی حەقیقەتە، نەك بە، بەکارهێنان و سەپاندنی مەینەت بەسەر رکابەردا، بەڵکو بەسەپاندنی سەختی و مەینەت بەسەرخودی خۆتدا."*

کاتێك کە گشت هەوڵەکان دەخرێنەگەڕ بەڵام لەبەر هەر هۆکارێك هیچ گۆرانکارییەك بەسەر رکابەردا نایەت، ئاسایی دەتوانرێ یەکێ لەم دوو رێگەچارەیە هەڵبژێردرێ، یان شێوازێ بۆ داگیرکردنی دڵی وی بدۆزرێتەوە، یان ناچار بکرێت پاشگەز ببێتەوە لەبانگەشەکانی. شێوازی باو، هەڵبژاردنی رێگەچارەی دووەم و دەست درێژکردنە بۆ توندوتیژی. بەڵام ساتیاگراهی، بەرگریی رەکابەرەکەی بە تەحەمولکردنی رەنج و خۆپارێزی لە بەکارهێنانی زۆر بەرامبەر بە رکابەرەکەی، کەم کەم لەناو دەبات و دیدگای ئەو دەگۆڕێ.

## ئەفریقیای باشوور، ساڵی ١٩٠٦

**هیندستان، ساڵی ١٩٣١:**

"*تا ساڵی* ١٩٠٦ *کۆششی من تەنها بۆ جوڵاندنی بیرکردنەوەی خەڵکی بوو. چاکەکارێکی پڕهەوڵ و ماندوونەناس بووم... بەڵام کاتێك کە لە ئەفریقیای باشوور ساتەوەختی هەستیار و چارەنووساز هاتەپێش، بۆم دەرکەوت کە لۆژیك بەشێوەیەکی پێویست توانای کاریگەربوونی نییە. خەڵکەکەم هاتبوونە خرۆش؟ جێی سەرسوڕمانیش نەبوو، چونکە تەنانەت هەندێ جار تەنانەت بەخشش-یش، چییەتی خۆی دەگۆڕێ- باسی تۆڵەسەندنەوە و دەستدانە توندوتیژی بەسەر زارەکانەوە بوو. من دەبا یەکێ لە دوو ڕێگە چارەکەم هەڵبژاردایا: پشتگیریکردن لە توندوتیژی، یاخود دۆزینەوەی شێوازێکی تر بۆ ڕووبەڕووبونەوەی قەیرانەکە و دامرکاندنەوەی. لەم نێوانەدا بەهزرمدا هات کە، دەتوانرێ لە ملدانەبەر یاسا سوکایەتی پێکەرەکان خۆت دەرباز بکەیت و گەر دەسەڵاتداران چارەسەر بە، خستنە بەندیخانەی ئێمە دەبینن، خۆبەخشانە بڕۆینە بەندیخانە. بەم شێوەیە شێوازێکی هاوتا لەگەڵ جەنگ، بەڵام پشت ئەستوور بە ئاکار و ڕەوشت پێی خستە نێو پانتایی بوونەوە... لەوکاتە بەدواوە ئەم بڕوایە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لەمندا پەرە دەسێنێ کە ناتوانرێ مافە چارەنووسسازەکانی خەڵکی تەنها لە ڕێگەی بەنیشانەگرتنی لۆژیك وەدەست بێنی؟ بەڵکو بەهاکەی*





*خۆڕاگرتنی خۆبەخشانەی سەختییە. یاسای مرۆڤایەتی خۆڕاگرییە لەبەردەم سەختیدا؟ جەنگ یاسای ئاژەڵەکانی دارستانە. بەڵام بۆ گۆڕانکاری هێنان بەسەر ڕکابەردا و کردنەوەی گوێی بەبانگی لۆژیك، خۆڕاگرتن لەبەردەم سەختیدا زۆر زۆر کاریگەرترە لە یاسای جەنگەڵ... ئەو ئەنجامە گرنگەی کە پێی گەیشتووم ئەمەیە کە ئەگەر نیازی ئەنجامدانی کارێکی بەراستی گرنگتان هەیە، نابێ تەنها بە قایلکردنی لۆژیك وازبهێنیت، بەڵکو دەبێ ڕێ بەنێو دڵەکانیش بەرن. پەنابردنە بەر لۆژیك پتر کار لە مێشك دەکات، بەڵام چوونەنێو دڵەکان تەنها بە خۆڕاگری لەبەردەم سەختی نەبێ، نایەتە دی. ئەمە سەختی (ڕەنج)ە کە هاودڵی دەروونیی لە مرۆڤەکاندا هەڵدەگیرسێنێ*."

بەم شێوەیە بوو کە خۆڕاگریی خۆبەخشانە لەبەردەم سەختیدا کە دووایین چەکە بۆ چوونە نێو دڵی مرۆڤەکان، بووە هێما(دروشم)ی بزووتنەوەی ساتیاگراها. شێوازەکانی یاخیبوونی مەدەنی، مانگرتن و نەبوونی هاوکاری، نەك بۆ خستنەژێر گوشاری یاسادانەرانی ئەفریقیای باشوور و پاشتر(ئینگلیز) بێت، بەڵکو بۆ نەرمکردنی دڵیانە، بە بینینی مەینەتە سەپێنراوەکانی سەر لایەنگرانی ساتیاگراها داڕێژرابوو. بەرهەمی خێرای یاخیبوونی مەدەنی شتێ نەبوو جگە لە تەحەمولکردنی بەندیخانە و تاڵانکرانی ماڵ و دارایی، ئارامگری لەبەردەم لێدان و تەنانەت هەندێ جار بەرەو پیرچوونی مەرگیش. گاندی زۆر جەختی لەسەر ئەم خاڵە دەکردەوە کە:" *ساتیاگراها و لقەکانی، واتە نەبوونی هاوکاری و بەرگریی نەرێنیی، شتێ نین جگە لە هەندێ ناوی نوێ بۆ یاسای سەختی کێشان*." و ئەمە خاڵێکە کە زۆربەی کات پشتگوێ دەخرێت.

ئەوەی ساتیاگراهی بێت لە هەوڵی خۆیدا بۆ دروستکردنی متمانەی بەرامبەر، دەبێ هەمیشە ئاگاداربێ کە هیچ جۆرە سەخڵەتییەك یا ئازاردانێك بۆ ڕکابەرەکەی دروست نەکات و هەموو وزەی خۆی بخاتە گەڕ لەپێناو پاراستنی ڕیزی وی. بەسەیرکردنێکی سەرزارەکی بۆ خەباتی ساتیاگراهیی گاندی، لەوانەبێت وەها بێتە

بەرچاو کە ئەو تەنانەت بەبەهای بەقوربانیکردنی ئامانجی خۆی، ئامادەی پاشگەزبوونەوە نییە لەم یاسا و بنچینانە. بەڵام دەبێ لەیادت بمێنێ کە هێنانەکایەی گۆڕان کارێکی سانا نییە و هەندێ جار شێوازی ساتیاگراها لەخەباتی سیاسیدا هەندێ کات خوازیاری دەرچوونە لە سنوری داب و نەریتەکان. ساتیاگراها دەزانێ کە ئەو گۆڕانکارییەی کە ئەو لە رکابەرەکەیدا بەدووییدا دەگەڕێ بە ئاسانی بە دەست نایەت، بۆیە هەوڵ دەدا کە لە هەرجۆرە گرفتێك کە بۆ رکابەرەکەی دروست دەکات ئاگادار بێت و تا ئەوپەڕی توانای خۆی بۆ ئاسانکردنی ئەو گرفتانە تێ بکۆشێ. ئامانجی ئەو هێرشکردنە سەرخەڵکی یا ئازارپێگەیاندنیان نییە، بەڵکو گۆڕینی ئەو سیستەمەیە کە بۆتە بەربەستێ لەبەردەم گەیشتنی هەموو خەڵك بە خۆشگوزەرانی و خۆشبەختی.





## ئەفریقیای باشوور

## ناتاڵ، ساڵی١٩١٣

*"کاتێ کە کرێکارە هیندییەکانی دانیشتووی کەناراوە باکورییەکان دەستیاندایە مانگرتن، نەگواستنەوەی قامیشە دروێنەکراوەکان بۆ ئاشە تایبەتییەکانی، زیانێکی قورسی بەرەو رووی خاوەن زەوییەکان دەکردەوە. بەم هۆیەوە ٢٠٠ کەس لە هیندییەکان تەنها و بە تایبەت بۆ سەروسامان بەخشین(خستنەوەگەڕ)ی ئەم بەشەی کار گەڕانەوەسەر کارەکانیان و کاتێ پەیوەندییان کردەوە بە هاووڵاتییەکانیانەوە کە کارەکانیان بەئەنجامگەیاندبوو. جارێکیش کاتێك کە کارمەندە هیندییەکانی شارەوانی(دۆربان) دەستیان لەکار کێشایەوە، ئەو کەسانەی بەجۆرێك کارمەند بوون لە خزمەتگوزارییە تەندروستییەکانی ناوچە شارنشینەکاندا، یا وەك پەرستیار لە نەخۆشخانەکاندا خزمەت و چاودێریی نەخۆشەکانیان دەکرد، گەڕانەوە سەرکارەکانیان و بەوپەڕی ئارەزووەوە دەستیان بە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی خۆیان کردەوە، چونکە ئەگەر خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان تووشی هەرجۆرە کەموکورتییەك دەهات، یاخود بۆ پەرستیاریکردنی نەخۆشەکان پەرستیار لە نەخۆشخانەکاندا نەدەما، نەخۆشی لەناوشاردا پەرەی دەسەند و نەخۆشەکانیش لە یارمەتییە پزیشکییەکان بێبەش دەبوون. هیچ ساتیاگراهییەك خۆی لەبەردەم روودانی ئەو جۆرە ئەنجامانەدا رانەدەگرت. هەربۆیە ئەو کارمەندانەی لەم جۆرە پیشانەیان هەبوو، لە مانگرتن بەخشران. ساتیاگراهی لەهەر هەنگاوێك کە هەڵی دێنێ، دەبێ خۆی لەجێی رکابەرەکەی دابنێت. من بەچاوی خۆم بینیم کە کۆمەڵێ رووداوی لەم جۆرە جوامێرییانە چۆن کاریگەریی نادیار بەڵام بەهێزی خۆیان لەهەموو شوێنێکدا بەجێ*

*دەهێشت... و کەشێکی لەبار بۆ بەیەکگەیشتن و چارەسەرکردنی کێشەکان دەهێنایەکایەوە."*

هەستی هاودەردی و خۆڕاگری و بەخشندەیی بڕواهەبوون بە رکابەر و هەبوونی ئامادەیی بۆخۆڕاگرتن لە بەردەم سەختی، چەکە سەرەکییەکانی ساتیاگراهین، بۆ هێنانەکایەی گۆڕانکاری لە رکابەردا و گۆڕینی جۆری پەیوەندییە توندوتیژەکانی نێوانیان. بە پەنابردنەبەر ئەم جۆرە چەکانە، بێمتمانەیی و توندوتیژی دەگۆڕدرێن بە متمانەو ریزی بەرامبەر و هاوکاری. گاندی بڕوای وایە کە، کاتێ کە کۆمەڵگا بگاتە ئەم ئاستە، ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی دژایەتی و جیاوازی وبەگژاچوونەوە بەخودی هۆکانیشەوە بەشێوەیەکی ئاشتیانە چارەسەر دەبن، چونکە ئێستاکە ئیدی"رکابەر" لە لایەکەوە بۆتە هاوپەیمانی ئێمە و ئەو ئاییندە مژدەبەخشە بەچاودەبینێ کە تەنها بە هاوکاری بەرامبەر نەبێت وەدەستهێنانی شتێکی ئەستەمە. ئەو ئیدی دەتوانێ هەست بەوە بکات کە ئەو شتەی کە لەبەردەم مەترسیدایە زۆر زۆر لە سوودە تایبەتیەکانی وی گرنگترە، فێر دەبێ کە چۆن دەتوانێ گرنگییەکی کەمتر بۆ سوودە تایبەتییەکانی خۆی دابنێ. روانگەی رکابەر بەجۆرێك لەگەڵ رێچکەی یاخود شێوازی ساتیاگراهی هاوتەریب دەبێت و ئەگەریش بڵێین خودی خۆشی دەبێتە ساتیاگراهی، زیادەڕەویمان نەکردووە. ئەم"گۆڕانی رێچکەیە" لە رکابەردا ئامانجی سەرەکی ساتیاگراهایە؟ پەنابردنە بەرمانگرتن، رێپێوان و لەم جۆرە چالاکییانە هەموو بریتین لەهەندێ ئامراز بۆ وەدەستهێنانی ئەم مەبەستە.

*"یەکێ لە نیشانەکانی دروستیی ئەم رێگایە کە گرتوومانەتەبەر و زانینی ئەوەی کە ئایا بەڕاستی پاکە لە توندوتیژی یا نە،، ئەمەیە کە لە کۆتایی وەها خەباتێکدا، هیچ جۆرە کینەو رقێك لە نێواندا نامێنێ و دوژمنان دەبنە دۆست. ئەمە ئەزموونی من بوو لەگەڵ ژەنراڵ(سمۆتێز) لە ئەفریقیای باشوور. ئەو لە سەرەتادا بە سەختترین رکابەر و دژایەتیکەری من دادەندرا و ئەمرۆکە دۆستێکی گیانی بە گیانی منە..."*





ئامانجی ساتیاگراها پانتاییەکی فراوانتری هەیە لەوەی بێت تەنها رکابەر رازی بکات کە ئێمە مافی خۆمانە کە لە یاسا رەگەزپەرستانەکان، یاخود باجە نایەکسان و نا بەرامبەرەکان ناڕازی بین. لە راستیدا بوونی ئەم کێشانە خۆی لە خۆیدا هێمایەکە لە نەبوونی یەکسانی یاخود(ناڕاستی)یەکی گەورەترە کە چاککردنەوەیان لە ئامانجە سەرەکییەکانی ساتیاگراهایە. راستییەکەی ئەمەیە کە خەباتی ساتیاگراها هەرگیز بەشێوەیەکی هەمیشەیی خۆی تەرخانی خەبات لەپێناو هێنانەدیی مافە پێشێلکراوەکان ناکات و لەم رووەوە دەتواندرێ بوترێ کە بەرنامەیەکی کار و مەبەستێکی دیاریکراوی نییە. ساتیاگراها پێشتر بچووکترین بەشی شینەکراوەی شێوازی خەباتەکەی خۆی، واتە پابەندبوونی تەواو بە راستی و ناتوندوتیژی دەربڕیوە و بانگەشەی بۆ کردووە، بەم جۆرە (گەڕانەوەخوازی- سازگاری) و توانای هەڵکردن لەگەڵ هەوراز و نشێوەکانی خەباتی بۆ خۆی هێشتۆتەوە. ئەم تایبەتمەندییەی ساتیاگراها، جۆرێ نەرمی پێ بەخشیوە کە لە ئەگەری گۆڕانی هەلومەرج و ئاشکرابوونی راستەقینە، گۆڕینی سەنگەر دەرەخسێنی. گاندی ناوی ئەم تایبەتمەندییەی ناوە"یاسای هەڵکشان":

*" ئەزموون(تاقیکردنەوە) منی فێر کردووە کە یاسای هەڵکشان و پێشڕەویی بەردەوام، لە گشت ئەو خەباتانەدا کە حەقن تا ئەندازەیەك راستە. بەڵام لەمەڕ ساتیاگراها، ئەم یاسایە یاسایەکی بنچینەیی تەواو روون و ئاشکرایە. لە کاتی بەرەوپێشچوونی خەباتی ساتیاگراها هەندێ هۆی دیکەش دەست دەخەنە دەستی یەکتری، ئەو بەرهەمانەی کە دەرئەنجامیین دەیکەنە چەندین ئەوەندە و بەردەوام قەوارەکەی بەرەو زیادی دەبەن. وەها بارێك بەڕاستی ناتوانرێت خۆتی لێ بەدوور بگری و لە بنچینە سەرەتاییەکانی ساتیاگراهایە؟ کە لە ساتیاگراهادا بچووکترین بەش لە هەمانکاتدا گەورەترین بەشیشە و لەبەر ئەوەی بچووکترین بەش، هەرگیز کەم*

*نابێتەوە، پاشەکشێ و پاشگەزبوونەوە لە ساتیاگراهادا شوێنی نییە و تەنها جووڵەی ڕێپێدراو جوڵەی بەرەوپێشچوونە.*"

تایبەتمەندێتیی سنووردارنەبوونی ئامانجەکانی ساتیاگراها، ساتیاگراهی ناچار دەکات لە نەبەردەکانی خۆیدا بێوەستان و بەردەوام بەدوای حەقیقەتدا بگەڕێ و تەنانەت ئەگەر لە رکابەرەکەی خۆیشیدا بینییەوە، فێری ببێت و لە نەبەردەکانی خۆیدا بەکاری بهێنێت. وەها هەستێکی دەروونی نیشانەی هەڵگرتنی هەنگاوێکی مەزنە، چونکە تەنها بە بوونی ئامادەیی بۆ پێداچوونەوەی دیدگای خۆی دەتوانێ رادەی توندی کەشی جیاوازی و وشکی-یەکەی کەم بکاتەوە و شوێنگەیەك بێنێتە کایەوە کە ماوەی بەشداریپێکردنی گشت هەوڵەکانی تێدابێت. لەوەها کەشێکدا سەرلەبەری متمانەیەکە کە بانگەشەکارییە جیاوازەکانی هەردوولایەن، لە کۆتاییدا وەك راستییەکی تاقانە بەدیار دەکەون. ئەم رەوتە رووی پراکتیکی جیهانبینیی ساتیاگراهایە، لەسەر ئەو بنچینەیەی کە هەموو ئێمە لە بنەڕەتدا خوازیاری یەك حەقیقەتین؟ هەر لەم رووەوەیە کە گاندی پێیداگرتووانە دەڵێ:"*ئەوەی ساتیاگراهی بێت هەرگیز ماوەی ئاشتبوونەوە لەدەست نادات، بەڵام بە پاراستنی هەلومەرجە ئابرومەندانەکانیشییەوە..*". دیدگای ساتیاگراهی لەسەر بنچینەی یەکبوونی حەقیقەت لە قووڵایی دەروونی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێ و لەم رووەوە کارا و بەرەنگاریلێنەکراوە. لە پرتەوی رۆشنگەری ساتیاگراهادا جیاوازی و ناهەماهەنگییە بێ بایەخەکان، جێی خۆیان دەدەنە گەڕانێکی هیوادارانە بۆ هەماهەنگی.





## ئەفریقیای باشوور

## ترانسواڵ، ساڵی ١٩١٤

"لەگەڵ(ئاندریۆس)[٧٣] چووین بۆ(پرۆتۆریا). رێك لەوکاتەدا کە کارمەندە ئەورووپییەکانی کۆمپانیای هێڵی شەمەندەفەری(یۆنێون) مانگرتنێکی بەرفراوانیان بەرێ خستبوو و دەوڵەتیان خستبووە هەلومەرجێکی زۆر هەستیار و نالەبارەوە. وەك ئامۆژگارییەك بەمنیان گوت کە رێپێوانی هیندییەکان لە دژی دەوڵەت لەوەها هەلومەرجێکی لەباردا(هەڵبەت بۆ ئێمە) دەست پێبکەم؟ بەڵام من رامگەیاند کە هیندییەکان ناتوانن یارمەتیی مانگرتووەکانی هێڵی شەمەندەفەر بدەن، لەبەر ئەوەی مەبەستیان ئەوە نییە میری بخەنە تەنگانەوە. خەباتی ئێمە ناوەرۆکێکی تەواو جیاوازی لەگەڵ خەباتی مانگرتواندا هەیە و بە چەندین هاندەری دیکە دارێژراوە. تەنانەت ئەگەر بڕیاری ئەنجامدانی رێپێوانیشمان بدایا لە کاتێکی دیکە و پاش چارەسەرکردنی کێشەی هێڵی شەمەندەفەر ئەم کارەمان بە ئەنجام دەگەیاند. ئەم بڕیارە کاریگەرییەکی قووڵی بەجێهێشت و ئاژانسی هەواڵنێری(رۆیتەرز) ئەم هەواڵەی ناردە ئینگلیز،(لۆرد ئەمپتل)[٧٤] [وەزیری داگیرگەکان(مستعمرات)]، پەیامێکی پیرۆزبایی لە ئینگلیزەوە بۆ ناردین، دۆستە ئینگلیزەکانیشمان لە ئەفریقیای باشوور ستایشی ئەم بڕیارەی ئێمەیان کرد."

سەرکەوتن لە ساتیاگراهادا هیچ پەیوەندییەکی بە رەزامەندبوون لەسەر مەرج و خواستەکانی ئێمە نییە، بەڵکو تەنها بە رادەی پاکیی مەبەست و پابەندبوون بەراستی و ناتوندوتیژییەوە هەڵدەسەنگێنرێت. لە قوتابخانەی گاندیدا وەدەستهێنانی مەبەستە پاکەکان تەنها بە پەنابردنە بەر کەرەستەی پاك دەبێت؟ لە روانگەی ئەوەوە،" *پەیوەندیی هەمیشەیی نێوان مەبەست و کەرەستە، رێك وەك پەیوەندی نێوان درەخت و*

73- Andrews
74- Ampthill

*ناوکەکەیەتی*". ئەو پێداگرتووانە بە هەوادارانی بزووتنەوەی ساتیاگراهای دەڵێت کە بەردەوام تەنها بیر لە هەوڵەکانی خۆیان بکەنەوە، چونکە"هەوڵی تەواو و کامڵ، خودی سەرکەوتنە." لە ئەگەری پاکبوونی کەرەستە، ئامانجیش خۆبەخۆ پاك دەبێت؟ بەڵام ئەگەر ناڕاستی یا توندوتیژی کەرەستەکان پیس بکات ئامانجەکەش پیس دەبێ. گاندی بە ئەزموون گەیشتبووە ئەم ئەنجامانە، ناوبراو وەها دەڵێ:

"*بەم حاڵەشەوە ئەهیمسا کەرەستە و حەقیقەت و ئامانجە. تایبەتمەندیی کەرەستە لە، لەبەردەستبوونی بەردەوامییەتی، کەواتە رەچاوکردنی ئەهیمسا بڵندترین ئەرکی ئێمەیە و ئەگەر لە هەڵبژاردنی کەرەستەی خود-دا وردبین بین، درەنگ یا زوو بە مەبەستیش دەگەین. کاتێك کە لەم خاڵە بگەین بێ چەند و چون سەرکەوتنی کۆتایی هی ئێمە دەبێ و نابێ کە رووبەرووی هەر سەختییەك دەبینەوە و هەر شکستێکی رووالەتیش کە بەخەمان دەگرێت دەست لە بەدواگەڕانی راستەقینە(حەقیقەت) هەڵگرین.*

لە خەباتە توندوتیژئامێزەکاندا، توندوتیژی و دوژمنکاریی، دوو پێویستیی سەرکەوتنن و وەك گرێ(غودە)یەك هەو دەکا و بارگەی پێشڕەوی خاو دەکاتەوە، یاخود دەیتەقێنێتەوە و رێچکەی خەبات بەرەو پاش دەگەڕێنێتەوە، سەرکەوتن و توانای دەستبەسەراگرتن لە بزووتنەوەی ساتیاگراهادا هەمیشەیی و پایدارە چونکە لایەنێکی شکست خواردووی تێدا نییە. لە شێوازی ساتیاگراهای راستەقینەدا دوولایەن هاوبەشی چارەسەرکردنی کێشەن و دژایەتی و دوژمنایەتی و نەبوونی بڕوا لادەبرێت. ئەو فیلمەی کە دەرچوونی لەشکری دووردرێژی ئیمپراتۆریەتی ئینگلیز لە خاکی هیند نیشان دەدا لە ساڵی١٩٤٧دا لەنێوان هات و هاوار و دەربڕینی هەست و نەستی هیندییەکاندا، دەربڕی ئەم راستییەیە. هەروەك(ئارنۆڵد توین بی)[٧٥] لەو سەردەمەدا وتوویەتی، گاندی تەنها هیندستانی رزگار نەکردووە، ئەو(بەریتانیای گەورە)یشی رزگار کردووە.

75- Arnold toynbee





## ئەفریقیای باشوور

### ترانسواڵ، ١٩١٤

"*یەکێ لە سکرتێرەکانی ژەنەراڵ سمۆتێز بەگاڵتەوە پێمی دەگوت: 'من خەڵکی ئێوەم خۆشناوێ و حەزم پێیان نییە و هیچ حەز ناکەم یارمەتییان بدەم. بەڵام چارە چییە؟ کاتێك ئێوە لە رۆژە سەختەکاندا یارمەتی ئێمە دەدەن، ئێمە چۆن دەتوانین دەست لە روتاندا هەڵبێنین؟ زۆر حەزم دەکرد ئێوەش وەك مانگرتووە ئینگلیزەکان دەستتان بدایەتە کاری توندوتیژی، ئەوکات ئێمەش دەمانزانی چۆن لە شەڕ و بەڵاتان نەجاتمان بێت. بەڵام ئێوە تەنانەت ئازاری دوژمنەکانیشتان نادەن. سەرکەوتنتان تەنها لە چوارچێوەی رێز و جوامێریدا دەوێ کە خۆتان بەسەر خۆتاندا سەپاندوتانە و هەر ئەمەیە کە ئێمە بەرەو ئەوپەڕی داماوی کێش دەکا.*"

### ساتیاگراها لە سەردەمی ئێمەدا

تا ئێرە لەسەر شێوازەکانی بەکارهێنانی ساتیاگراها لە بواری سیاسیدا رۆیشتووین، بەڵام دەبێ لە یادمان بێت کە بنچینە فەرمانڕەواکانی سەر ساتیاگراها، لە کێشە تایبەتی و خێزانی و چینایەتییەکانیشدا بە هەمان ئەندازە کاریگەری هەیە. مەبەستی ساتیاگراها وشککردنی ریشەکانی هەر جۆرە جیاوازییەك و ناچارکردنی دژایەتیکەرەکانە بە هاوکاریکردن، بۆ گاندی ئەمەی کە ئەم جیاوازییانە لە نێوان پارتی کۆنگرە و ئیمپراتۆرییەتی ئینگلیز یاخود لەنێوان چەند جوتیارێك و خاوەن زەوییەك، یا لەنێوان ژن و مێردێك بێ، هیچ جیاوازییەکی نەبوو. بەردەوام دەیگوت:"*بەو شێوەیەی کە گرووپەکان دەتوانن بنچینەکانی ساتیاگراها بەکاربهێنن، تاك بە تاکی*

*مرۆڤەکانیش دەتوانن وەها بکەن، لە کێشە خێزانییەکانیشدا وەك کێشە سیاسییەکان دەتواندرێ پەنای وەبەر ببرێت."* گشتگیربوونی شیاوییەکانی لە هەموو مەیدانەکاندا، نیشانەی هەمیشەزیندوویی و شکست نەخۆری-یەتی."

بێ گومان چەمکی ساتیاگراها لای گاندی زۆر بەرفراوانترە لەو دیمەنەی کە ئێمە ئەمڕۆکە لە هزری خۆماندا هەمانە بۆی، دیمەنێك کە شتێ نییە جگە لە بەکارهێنانی لە کێشە سیاسییە پەتییەکاندا. ئەو جێگایەکی تایبەتمەندی بۆ ساتیاگراها لە ژیانی مرۆڤایەتیدا دادەنا و بەرێگەچارەیەکی تەواوی بۆ چارەسەری جیاوازییەکان دادەنا. بۆ ئەوەی بە تەواوی لە ساتیاگراها بگەین بەو شێوەیەی کە مەبەستی روانگە- دید-ی گاندی بوو، دەبێ چاوپۆشی لە بەرخوردە باو و هەمیشەییەکانی بکەین و ساتیاگراها بە شتێکی فراوانتر لە دژایەتییەکی چینایەتی و ناتوندوتیژی بزانین. دەبێ هەوڵ بدەین ئەنجامەکانی بەکارخستنی ساتیاگراها، لە بواری کێشە تایبەتییەکان(کەسی)یەکانیشدا تاقی بکەینەوە، بەم شێوەیە سوودبەخشبوونی ساتیاگراها لە ژیانی تایبەتی خۆماندا پتر ئاشکرا دەبێت.





## "ساتیاگراهای تایبەتی"

ئەوەمان لە یادبێت کە ناتوانین پڕاوپڕ و بە وردی وەك"شێواز"ێك بنواڕینە ساتیاگراها؟ هەروەك چۆن عەشقیش بریتی نییە لە شێوازێك. گاندی لە بنەڕەتدا ساتیاگراها وەك تێڕوانینێك یاخود بە دۆخێکی تێکەڵ لە عەشق و ناتوندوتیژی دەبینیێ، دۆخێك کە جۆری پەیوەندی ئێمە لەگەڵ خەڵکانی دی دیاری دەکات، ئەو تێڕوانینەیە کە لەناخەوە سەرچاوە دەگرێ، نەك لە دەرەوەی مرۆڤەوە، ساتیاگراها بەو شێوەی کە گاندی لێی تێگەیشتبوو بابەتێکی تایبەت بە تاکە، لە یەکێ لە نووسینەکانیدا وەها دەڵێت:" من بەردەوام بڕوام وەها بووە کە ئەگەر تەنانەت کەسێکی تاق و تەنهاش تا رادەیەك پابەندبوونێکی تەواوی بەرامبەر بە ناتوندوتیژی هەبێ، لە توانایدا دەبێ کە ئاگرەکە دامرکێنێتەوە." گاندی وەها بڕوایەکی بە تاکەکەسی بوونی ساتیاگراها هەبوو، کە لە کۆتاییدا وەهای گوت:" *ئەگەر هەواداری ساتیاگراها تەنانەت تاقە کەسێش بێت و تا کۆتایی لەسەر بڕوای خۆی بمێنێتەوە، سەرکەوتن شتێکی لەسەدا سەدە."* ساتیاگراها بە دوور لە هەنگاوپێشخستنە چینایەتییەکان، لە بنەڕەتدا کێشەیەکی تایبەتییە کە لە دڵی مرۆڤەوە دەست پێدەکات و بۆ ئاشکرابوونیشی هیچ پێویستییەکی بە هەوادار و شوێنکەوتوو نییە، هێزی ساتیاگراها پێویستی بە چەندێتیی ژمارەی تاکەکان نییە، ساتیاگراها دەکرێ و لە توانایدایە راستەوخۆ بگوازرێتەوە، رێك وەك گڵۆپێکی بەهێز بەڵام بچووك، کە دەتوانی رووی بکەیتە هەر کونج و کەلەبەرێ کە دژایەتی و هەڵچوون باڵی کێشاوە بەسەریدا و رووناکی بکەیتەوە. بە وتەی گاندی:*" جوانی ساتیاگراها لەوەدایە کە خۆی بەپیر مرۆڤەوە دێت و پێویست ناکات بەدوایدا بگەڕێیت."* تەنها دەبێ

*بەشێوەیەکی پێداگرتوانە لە دڵدا تۆکمەی بکەین.* ئەم روانگەیە یەکێکە لەیەکەمین کەرەستەکانی ساتیاگراهای گاندی و هەرچی روونتاکتر بتوانین تێی بگەین، خێراتر دەتوانین سایتاگراها بخەینە کار بۆ چارەسەرکردنی ئەو برینانەی کە دەرهاوێشتەی جیاوازی و دژایەتییەکانن.

بەڵام تەنها تێگەیشتن لەم بابەتە بەس نییە. هەروەك بینیمان ساتیاگراها لە بەدواداچوونی شێوازێکەوە سەرچاوە دەگرێ و پێی دەگا کە ئامانجی لابردنی خواستە تایبەتییەکانە. گاندی زۆر بەتوندی جەختی لەسەر ئەم بابەتە دەکردەوە، لەشوێنێکدا نووسیویەتی:" *بەبێ خاوێنکردنەوەی خود، رەچاوکردنی یاسای ئەهیمسا هیچ نابێت جگە لە خەیاڵ، تاك تەنها کاتێ توانای دروستکردنی هێزی- بەرەنگاریلێنەکراو-ی سایتاگراهای دەبێ، کە لە قەید و بەندی هەر جۆرە هەوا و هەوەسێك لە بیرکردنەوە و وتە و هەڵسوکەوتدا رزگار بێت و بتوانێت دوورتر لە رووداوە دوژمنکارییەکانی ئەوین و کینە و خۆشەویستی و دوورەپەرێزی، خۆی ببینێتەوە.*" ئەگەر ساتیاگراها لەم یاسایانە چەك بکرێت، لە سەرچاوەی سەرەکیی هێزەکەی خۆی یاخود هەمان"هێزی رۆح" کە بە پەناوەبەربردنی دڵەکان بەرەو لای خۆی کێش دەکا، بێبەش دەبێت. کەسێك کە بۆ ناسینی سەرچاوەی هێزی ناتوندوتیژی بیر و لیکدانەوەکانی گاندی دەخوێنێتەوە، چەندین جار رووددەکاتەوە خۆی و داوای لێدەکرێت کە ناتوندوتیژی لەویژدانی هۆشیاریدا، موحکەم داچەقێنێ. گاندی لەکۆتاییەکانی دەیەی ٣٠-دا وەها دەنووسێ:" هیچ رێگەیەکی ناوقەدبڕ لە ئارادا نییە، تەنها رێگەیەك هەیە، ئەویش ژیانی ئەم دەستوورەیە و فەرمانەکانی بکرێتە ئەڵقەی گوێ. هەڵبەت بەکارهێنانی لەنێو قاڵبی ژیانی رۆژانەدا پێویستی بەلێکۆڵینەوە-خوێندنەوەی زۆر و هەنگاوگەلێکی





ئارامگرتووی نەژمێردراو و پاککردنەوەی خود-ە..." پاشتر درێژە بە وتەکانی دەدا و دەڵێ:" ئەگەر زاڵبوون بەسەر ئەم جۆرە فێرکارییانەدا ماوەیەکی درێژ بخایەنێ، هیچ مایەی نیگەرانی نییە، "چونکە ئەگەر ئەهیمسا تەنها شتی نەمر و تاهەتاییە لەژیاندا و تەنها شتێکە کە بەگرنگییەوە بۆی دەنوارِدرێ، کەواتە هەرچەندە لەپێناویدا هەوڵ بدەین بەزیادە ناچێ، سەرەتا بەدوای پاشایەتیی ئاسمانەکاندا بگەڕێن، ئەو کات هەرشتێکی دیکەش دەبیننەوە. پاشایەتی ئاسمانەکان، هەمان ئەهیمسایە."

ئەو شتەی کە گاندی لەسەری دەدوێ کارێکی سەختە و جۆرێکە لەسەپاندنی ساتیاگراها بەسەر خود-دا بۆ لەناوبردنی خواست و ئارەزووە تایبەتییەکان. گاندی دەتوانێ داوای وەها شتێك لەئێمە بکا، چونکە بەرێکی ئەوە هەمان رێگەیە کە خۆی پێیدا رۆیشتووە. ئەو شەوە دوور و درێژەی کە گاندی لە وێستگە تاریك و چۆڵەکەی شەمەندەنەفەری(مارتیسبۆرگ) بەرۆژی گەیاند، وای لێکرد بۆ یەکەمجار بیر لەهەندێ شت لەسەرووی خۆی و پێداویستییەکانی بکاتەوە، پەی بەقوڵایی مەینەتی لە رادەبەدەری هاوولاتییە هەژار و لەژێر کۆلۆنیالیستەکان بەرێ، کە پێیەوە دەیانناڵاند و گیرۆدەی بوون. ئەو ساتە دوور و درێژە پڕلە شکۆیانەی لە تەنهاییدا لەچاوەڕێیی بەرەبەیان بەرێی کرد، دیدگایەکی بەدیاریی پێ بەخشی کە ئەو و دیدی ئەوی بەرامبەر بەژیان و مەبەستەکەی گۆڕی. گاندی باس لە چەند سەرچاوەی گرنگی سروش(ئیلهام) دەکات لەژیانیدا، لەوانە(تۆلستۆی و راسکین)، لەپیادەرەوییە دوورودرێژ و ناچارییەکانی شۆڕشی زۆلۆکان و لەو روئیایەی کە لە شاری(مەدرس)دا هات بەپیرییەوە و ئامۆژگاری دەستپێکردنی رێپێوانی خوێ-ی پێیگوت، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، ئەزموونی خۆی لەو شەوە

ساردەدا لە وێستگەی ماریتیسبۆرگ، هۆکاریکی تایبەتمەند بوو کە بووە هۆی ئەوەی ئەزموونە دوور و درێژەکانی بکەوێتە بەرهەم و بەتەواوەتی لەم دۆخەوە بیگۆڕێ بۆ دۆخێکی تر. بزووتنەوەی ساتیاگراهای ئەفریقیای باشوور پتر لە١٠ ساڵ پاش ئەو رووداوە هاتە ئاراوە، چەمکی ساتیاگراها لەو ڕووداوانەدا کە گاندی لەئایندەدا رووبەڕوویان دەبوویەوە خۆی لەو سەردەمەدا حەشاردابوو کە هێشتا نە ناوێکی بەخۆوە گرتبوو، نە هێشتا بیری لێکرابوویەوە، لەگەڵ ئەمەشدا لەو ساڵە پڕ لە فشارهێنانەی خەباتدا، گاندی بەرەوڕووی هەستی چوونی خود لەپێناوی سوودی تایبەتی وەستایەوە و ڕیشەکێشی کرد، ئەمە هەمان سەپاندنی ساتیاگراهایە بەسەر خود-دا کە گاندی لەئێمەی دەوێ و بەهۆکاری پاکبوونەوەی دەزانێ. بەم شێوەیە دەتوانرێ بگوترێ یەکەم رکابەری گاندی لە بەرەنگاریی ناتوندوتیژی، ژەنڕاڵ سمۆتێز یاخود حکومەتی ئەفریقیای باشوور نییە، بەڵکو خودی موهاندس گاندییە، هەروەها یەکەم مەیدانی خەباتی سەختی ناتوندوتیژی، شوێنێکی دی نەبوو جگە لەویژدانی ئاگای خۆی، ئەم بەرەنگاری-خەباتە یەکەم هەواداری ساتیاگراهای دروست کرد و بەم شێوەیە لەو(پارێزەرە بێکارە) ماهاتمایەك(رۆحێکی مەزن) دروست بوو. بۆ بەدواداچوون و دۆزینەوەی هێزی ناتوندوتیژی گاندی، دەبێ بنوارینە قۆناغی ئەودیوی شۆڕشە سیاسییەکانی هیندستان کە جیهان پێی ئاشنایە؟ دەبێ دەست بەلێکۆڵینەوەی ئەو ساڵە هێمن و ئارام و چارەنووسسازانە بکەین کە گاندی لە دەوروبەری(ناتاڵ) و ترانسواڵ بەسەری برد. لەوێیە کە گاندی رێگەیەکی بۆ گۆڕینی ئەو پارێزەرە بێ بڕوا بەخود-ە دۆزییەوە و خستییە باری تاقیکارییەوە؟ هەر لەوێشەوەیە





کە دەتوانین بۆ رووناك بوونەوەی مێشکی خۆمان، سەرچاوە و ریشەی ئەو گۆڕانکارییە ببینینەوە.

بەڵام تەنها بە لاساییکردنەوە و دووبارەکردنەوەی کارەکانی گاندی مافی خۆمان پێنەداوە، بە تاشینی قژ و لەبەرکردنی قوماشی کەتان، بە خواردنی میوە و وشکە و بە، شیری بزن ژیان، تەنها لەبەر ئەوە کە گاندی وەهای دەکرد لادانە لەبابەتی سەرەکیی کێشەکە. شوێنکەوتوانی گاندی دەبێ هەمیشە هوشیار بن کەبنچینە سەرەکییەکانی بیری گاندی فێربن، نەك ئەوەی کە تەنها جوولە و دۆخە رووکارییەکانی ئەو ئەنجام بدەن،-کە ئەو وەك هۆکارێ بۆگواستنەوەی پەیامەکەی بەئەنجامی دەگەیاند-. لێبووردەیی، هەستی هاودەردی و ئامادەیی بۆ خۆڕاگرتن لەبەردەم سەختی و مەینەتیدا، پێوەرە سەرەکییەکانی پێوانی"ساتیاگراهای کەسی"ن و هەر ئەم پێوەرانەش لەمەڕساتیاگراهای سیاسی راستن. فۆڕم بەخشین(شێوە پێدان) بەژیان بەو شێوەیەی کە لەگەڵ ئەم ئامانجانە بگونجێ-هەر بەوشێوەیەی گاندی ئەنجامیدا- یەکەمین هەنگاوە لە رێگای ناتوندوتیژییەکی حەقیقی و بەردەوامدا.

## ساتیاگراها لەخێزاندا

پەیوەندییە تایبەتییەکان(کەسییەکان) بوارێکی لەبارن بۆ فێربوون و بەکارهێنانی ساتیاگراها. گاندی ناوی لێدەنێت"ساتیاگراهایی نێومالّی". گەر بنوارینە قۆناغی ژیانی وی، ئەوکاتەی کە لە ئەفریقیای باشوور دەژیا واتای وتەکانی ناوبراو دەدۆزینەوە؟ بەلاّم جێگەی سەرنجە کە ئەو ساتیاگراهایەی کە لەمبارەوە قسەی لەسەر دەکەین ئەو شتە نییە کە گاندی پاشتر بەکاری هێنا، بەلّکو لەمبارەوە لەدژی وی بەکار هێنرا. گاندی بەدرێژای ئەو سالاّنەی کە لە ژۆهانسبۆرگ ژیا، مێردێکی دەسەلاّتخواز و هەندێ کات خولّق تالّ و بەهانەگیر بوو، بەو جۆرە کە خۆی دواتر دەگێڕێتەوە وایدەزانی کە سەپاندنی خواستەکانی خۆی بەسەر هاوسەرەکەیدا مافێکی لەسەداسەدی ئەوە. کاتێکیش کە کاستوربای نارەزایی لەمەڕ سەپاندنی یەك لایەنەی خواستەکانی وی دەردەبڕی، گاندی زیاتر لەسەر شێوازەکەی خۆی سوور دەبوو، بەلاّم کاستوربای هەستپێکردنێکی(غەریزی) لەمەڕ تایبەتمەندێتیی ئەوینی تێکەلّ بە ناتوندوتیژی هەبوو و بەدرێژای ئەو چەند سالّەی گێرمەوکێشە و بەگژداچوونە خێزانییەکان، خۆی بەهاوسەنگ و هاورێکی گاندی نیشاندا. شێوازەکەی کاستوربای پەیوەندی نێوان گاندی و خۆیی گۆڕی، کەم کەم جوانی و هێزی بەرەنگاریی ناتوندوتیژیی بۆ گاندی ئاشکرا کرد.

"*من ئەوکاتە وانەی ناتوندوتیژی لەهاوسەرەکەمەوە فێربووم، کە هەولّم دەدا هاوسەرەکەم لە بەرامبەر ئیرادەی خۆم تەسلیم بکەم. خۆڕاگریی سەرسەختانەی ئەو لەبەرامبەر خواستی من لە لایەکەوە و خۆڕاگرییە بێدەنگەکەی لە بەرامبەر ئەو مەینەتییانەی کەبێ عەقلّیی من بەسەریدا دەیسەپاند لەلایەکی ترەوە، لەکۆتاییدا منی شەرمەزار کرد و بووە هۆی ئەوەی*





*کە لە نەخۆشی کەم عەقلّیی خۆم رزگارم بێت، سەرەنجام ئەو بووە مامۆستای ناتوندوتیژیی من.*"

کاستوربای بێ ئەوەی خۆی بزانێ، سوودی لە گرنگترین چەکی ساتیاگراها وەرگرتبوو، واتە ئامادەبوون بۆ خۆڕاگری لەبەردەم سەختیدا لەبری تۆلّەخوازی، و هاوکات نیشاندانی ئیرادەی تۆکمە و موحکەم بۆئەوەی مێردەکەی بخاتە سەر رێگەی راست.

ساتیاگراها لەخێزانیشدا وەك باقی جۆرەکانی تر، هەر لەسەر ئەم بنچینەی هاوسەنگییە ناسکەی نێوان لەخۆبوردوویی و مەبەستی پایدارەوە داچەقیوە و گەر بەدروستی بەرکار بهێنرێ، دەتوانێ ببێتە بەردی بناغەی پەیوەندییەکی قولّ لەنێوان هاوسەرەکاندا. ئەو دۆزینەوەیەی کە گاندی لە پەیوەندی نێوخێزانیی خۆیدا لەسەرەتای سەدەی بیستەم لە(ژۆهانسبۆرگ) دەیخاتەڕوو، ئەمڕۆکە گرنگییەکی چارەنوسسازی هەیە، لەبەر ئەوەی پەیوەندییە نێوان خێزانییەکانی ئەم سەردەمە پڕ بووە لە بەگژداچوونەوە و تێهەلّچوون و ژمارەی ئەو خێزانانەی کە دەتوانن لەبەردەم ئەم تێهەلّچوونانەدا خۆ ڕابگرن و تێپەڕی بکەن زۆر نییە و تەلاّق و جیابوونەوە لەژیانی خێزانەکانی ئەم سەردەمەدا بۆتە وشەیەکی بەربلاّو و ئاشنای هەموان. لەوەها هەلومەرجێکی نالەباردا، دروستیی ئەو شێوازەی کە گاندی دەیخاتە روو پتر لەهەمیشە ئاشکرا دەبێت کە بریتییە لە، بەخشین، تەحەمولکردن، هەمیشە لایەنی رکابەر گرتن و لەکاتی پێویستیدا ئەویندارانە و بێ کینە خۆڕاگری نیشاندان. ئەم ئامانجە کاتێ دەگاتە لوتکە کە ژن بەردەوام خۆشگوزەرانی مێردەکەی بخاتە پێش خۆشگوزەرانی خۆی، مێردیش

خۆشگوزەرانی هاوسەرەکەی بخاتە پێش ئارامی و ئاسایشی خۆی. وەها پەیوەندییەك یەکێکە لەدەسکەوتە گەورەکانی ئەهیمسای ڕاستەقینە.

ساتیاگراها شوێنێکی سروشتی و ئاسایی هەیە لەپەیوەندی نێوان منداڵ ودایکان و باوکاندا، لێرەشدا لە خۆبردوویی تێکەڵ بە خۆڕاگری چوارچێوەی ئەم شێوازە پێکدەهێنێ. "بچووکترین بەش"ی ساتیاگراهای نێوخێزان(ماڵ)ی، پێشکەوتنی خۆشگوزەرانیی منداڵانە، پەروەردەکردن و نەشونماکردنیان لەپێش هەرشتێکی دیکەوەیە. ئەمە بەواتای جار بەجار قوربانیکردنی حەز و خواستە بچووکترەکان و وشەی"نا" هێنانە بەسەر زاردا، لەگەڵ هەبوونی حەزەکانی خودی خۆشتدا، بەڵام بە تۆکمەیی واتە بە شێوەیەکی پێداگرتووانە، ئەو شتەی لەبیری گاندیدا خاوەنی زۆرترین گرنگییە، بوونی گونجانە لەنێوان سومبولی هەڵسوکەوتی گەورەکان و ئامانجەکانیاندا. کاتێ کە گاندی ساڵی١٩٠٩ باروبنەی خۆی گواستەوە بۆ کێڵگەی(تۆڵستۆی)[٧٦]، کۆمەڵێ منداڵی نەگونجاوی لەگەڵدا بوو. گاندی لەسەر ئەو بڕوایەی کە هەموان ئەندامانی یەك خێزانن، خێرا ئەو منداڵانەی خستە ژێردەستی باوك ئاسای خۆیەوە. لەمبارەیەوە وەها دەنووسێ:" *بۆم دەرکەوت کە تەنانەت ئەگەر لەبەر ئەوانیش بووە دەبێ بەرێکی و بەپاکی و راستگۆیی بژیم.*" تۆوی ساتیاگراهای نێوخێزانی، لەکێڵگەی بەپیتی تۆڵستۆی چێنرا و لە درێژەی ئەو ساڵانەی کە بەدەم چاودێری کردنییەوە تێپەڕ بوون، کەوتە خونچەکردن و پاش ماوەیەك ئەو پەیوەندییەی کە بە ماندوبوونێکی زۆر لەگەڵ منداڵەکاندا پێکی هێنابوو، بووە سەرچاوەی توانای ئەو، ئیدی بەبێ هەوڵی زۆر، دەیپاراست و کۆنترۆڵی دەکرد.

---

٧٦- یەکێ لەو ئیشرامانەی کەگاندی دروستی کردبوو. وە، ك.





لەیەکێ لەساڵەکانی دەیەی ٣٠-دا ئافرەتێك هاتە ئیشرامی سواگرام و داوای لەگاندی کرد کە نەهێڵێت منداڵەکەی شەکر بخوات، وەڵامی گاندی سەرسوڕهێنەر بوو، داوای لێکرد کە هەفتەی داهاتوو سەری لێ بداتەوە. ئافرەتەکە بە سەرسوڕمانەوە رۆشت و بە پێی فەرمانی(ماهاتما) بەرێکی پاش هەفتەیەك گەڕایەوە. گاندی کاتێ چاوی بە کوڕە بچکۆڵەکە کەوت گوتی:"*داوات لێ دەکەم کەئیتر شەکر نەخۆی، بۆ تەندروستیت باش نییە.*" پاشان گرتییە باوەش و کەمێك گاڵتەی لەگەڵدا کرد و بەرێی خست. دایکی منداڵەکە کە نەیتوانی فزولیەتی خۆی بشارێتەوە، مایەوە و پرسیاری لە گاندی کرد: "بۆچی هەفتەی پێشوو کە هاتین هەر ئەمەت نەوت؟ بۆچی گوتت کە دوایی بێینەوە؟" گاندی بە بزەیەکەوە وەڵامی دایەوە:"*هەفتەی رابردوو خۆم خەریکی شەکرخواردن بووم.*"

گاندی لەهەموو پەیوەندییەکانیدا حەزی لە بەڵگەهێنانەوە و وتوێژکردن بوو. تەنانەت لەلوتکەی بزووتنەوە رزگاریخوازنەکەی هیندستاندا، هەرگیز روخسەتی نەدەدا کە خەباتەکەی بەرەو دۆخێکی دوور لە وتویژ هەنگاو بنێ. هەرچەندە رکابەرەکانی لەپشت دالانە مەڕمەڕییەکان و دەمامکە پڕ لەشان و شکۆکانەوە خۆیان زۆر بەدامەزراو نیشاندەدا، بەڵام لە دیدی گاندیدا پتر لەهەرشتێ ئەوان مرۆڤ بوون، ئەو مرۆڤانەی کە ناتەواوی و سستییەکانی خودی ئەویان هەبوو، لەتایبەتمەندییە مرۆییەکاندا وەك ئەو بوون، بوونی پەیوەندی لەسەر بنچینەی بەڵگەهێنانەوە و وتوێژ بۆ گاندی، نە خۆبە هونەریی دەرخستن بوو، نە بار-ێکیش کە سەپێندرابێت بەسەریدا، بەڵکو روویەکی سروشتی ئەوپەڕی پێویستی ئەهیمسا بوو و لەگشت چینەکانی پەیوەندی نێوان مرۆڤەکاندا کەشی دیالۆگ و گۆڕینەوەی راوبۆچوون کە

مەیدانی ساتیاگراهاکانە، دەیهێنایە کایەوە. ئالێرەدایە کە دەبینین چۆن گاندی بازنەی داخراوی دۆستایەتی خۆی فراوان کرد، کە لە پوربەندەر و ژۆهانسبۆرگ لەخێزانی سەرەکیی خۆی زیاتر نەبوو و چۆن پانتایی پێبەخشی بۆ خەڵکانێکی زۆر کە لە ئیشرامدا لەگەڵی دەژیان و لەکۆتاییدا هەموو هیند و پاشان گشت جیهانی گرتەوە.

## ساتیاگراها لەشوێنی کاردا

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ساتیاگراهای کەسی، ساکاری و ئاسان بەکارهێنانییەتی لەشوێنی کاردا. ئەوشتەی کە لەمەڕ پەیوەندییە خێزانییەکان راستە، هیچ نەبێ تاڕادەیەك لەمەڕ پەیوەندیی تاکەکانیش لە شوێنی کاردا راست و دروستە. ئەگەر لایەنی هەست-احساس-ی ساتیاگراهای کەسی بەو ئەندازەی کە لەنێومالّدا حوکمڕانە کەمتر خۆی بنوێنێ، دەتوانێ بەهەمان رادە کە، زیان لە پەیوەندییە خێزانییەکان دەدات لەشوێنی کاریشدا وێرانکار بێت. کار هەرگیز ڕاناوەستێ و لە هەر شوێنێك کە چەند نەفەرێ لەپاڵ یەکدیدا خەریکی کارکردنن، بەهۆی جیاوازی نێوان سوودە تایبەتییەکان ئەگەری تێهەڵچوون زۆر لەئارادایە. تاکەکان مادامەکی لەشوێنی کاردا زۆرترین گرنگی بۆ قازانجەکانی خۆیان دادەنێن، خۆلادان لە سەرهەڵدانی پێکدادان شتێکی ئەستەمە. زۆربەی جیاوازییەکان بەدەوری خولگەی بیروڕا و چەشە(سەلیقە) تایبەتییەکان و جیاوازی لەسەر چۆنییەتی ئەنجامدانی کارەکاندا دەگەڕێ و زۆربەی کات هەستە ئێرەییەکان و زوێربوونە بیرتەسکانەکان پەرەیان پێدەدا. لەوانە بێت لەدیدی یەکەمدا"بابەتی" زۆربەی





ئەم گێرمە و کێشانە بە کێشەی پیشەیی و تەنانەت فەلسەفیش خۆی بنوێنێ، بەلاّم بەزیاتر لێ ووردبوونەوە ئاشکرا دەبێ کە لەهەموویاندا دوو"من"ی گۆڕانخواز لە کێشمەکێشێکی تایبەتدا گرفتار بوونە، چونکە وەك باوە "باشترین" شێوازی ئەنجامدانی کارەکان ،ئەو شێوازەیە کە"من" گرتوومەتە بەر. بەوتەی زانایەکی هیندی:" هەر کەسێك پێی وایە کە تەنها کاتژمێرەکەی خۆی راستە."

لە"ساتیاگراهای شوێنی کاردا" کۆششی تاکەکان بۆ سڕینەوەی دەوروبەرە لە بە باشتر(مەزنتر) دانانی کەسایەتی خودی کەسەکە، بۆئەوەی هەردوولایەن توانای بینینی دیدگایەکی بەرفراوانتر و راستتریان هەبێت. تاکی بڕوادار بەساتیاگراها کە قۆناغگەلێکی بەرینتر لەتووش هاتن بەسوودی تایبەتی بەرێ کردووە و رووناکایی دیدی لەبازنەی سنورداری بیروڕا تایبەتییەکان تێپەڕ بووە، لە شوێنێکدایە کە دەتوانێ ئەو جیاوازییانەی کە هەن بە بێ لایەنی ببینێت و بەم شێوە دەست بداتە دۆزینەوەی زەمینەی هاوبەشەکان. گەر بەلّگەهینانەوە و لۆژێك ڕێی بەشوێنێ نەبرد(چارەسەرێکی نەدۆزییەوە)، دەبێ- وەك باقی جۆرەکانی ساتیاگراها- خۆی بۆخۆڕاگری و خۆبەدوورگرتن ئامادەبکات، بۆئەوەی لەم ڕێگەیەوە دیدی لایەنی بەرامبەر بەرەو شوێنێکی مەزن ڕێنوێنی بکات. بەم جۆرە لێرەدا ئەرکی ساتیاگراها هەولّدانێکی بێدەنگ بەلاّم بەردەوامە بەمەبەستی هەرچی زیاتر کەمکردنەوەی پابەندبوونەکان بەخواستەکەسی(تایبەتی)یەکان، لەپێناوی گەیشتن بەمەبەستێکی مەزنتر و بەرفراوانتر و گشتگیرتر. بوونی تەنها یەك تاکەکەس بەسە بۆئەوەی کەم کەم کاریگەری ئەهیمسا لەشوێنی کار، قوتابخانە یان تەنانەت دامەزراوێکی گەورە بلاّوبکاتەوە، بەلاّم هەروەك گاندی دەیگوت

ساتیاگراهاییەکی پابەند دەتوانێ وەها گۆڕانێك لەدەوروبەریدا ساز بدات کە کار لە کەشێکی پڕ لە هاوکاری و بڕواهەبوون بە بەرامبەر بەرەو پێش بچێت. ئەم دۆخە بەوتەی گاندی کە لە(بودا)وە دەیگێڕایەوە، بڵندترین جۆری کارە.

هەروەك بینیمان یەکێ لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ساتیاگراها، شیاوبوونییەتی بۆ گونجانێکی داهێنەرانە لەگەڵ هەلومەرجی نوێدا، هەڵبەت بە پاراستنی بنچینە نەگۆڕەکانی، واتە حەقیقەت و ناتوندوتیژی، ئەمڕۆکە ئەم گۆڕانخوازییە(سازگارییە) گرنگی خۆی پتر لە هەر سەردەمێکی دی نیشان دەدا، چونکە ئەو کێشە و ئاستەنگانەی کە ئەمڕۆکە رووبەڕوویان بووینەتەوە، لەگەڵ ئەوەی کە لە سەردەمی گاندیدا هەبوو، بە گشتی جیاوازە. لاسایکردنەوەی دەقاودەقی شێوەکانی خەباتی سیاسی گاندی، وەك مانگرتن و رێپێوانەکان، لە بازنەی چاکسازییە سیاسییەکاندا بە سەختی تەنگ بە ساتیاگراها هەڵدەچنێ، ئەو قەیرانانەی کە ئەمڕۆ مەترسییان لەسەر ژیانی ئێمە هەیە، پتر لەوەی کە سیاسی بن، قەیرانە رۆحییەکانن، لەخۆبێگانەبوونە تاکی و کۆمەڵایەتییەکان، هەستکردن بە تەنهایی و بوونی جەمسەرگری(دوورکەوتنەوە لەیەك) نێوان ژنان و پیاوان کە رۆژبەرۆژ لەزیادبوونن و هەروەها لاوان و پیر و پەککەوتەکانیش سەر بەم جۆرە قەیرانانەن، بەم هۆیەوە سەردەمی ئێمە پێویستی بە بزووتنەوەیەکی کۆڵنەدەرانە و پێداگرتووانە هەیە بەرەو رێگەی ناتوندوتیژی و هەستکردن بە یەکێتی لە پەیوەندییە خێزانی وکۆمەڵایەتییەکاندا.

گاندی پێی وابوو کە لە هەلومەرجێکدا کە ژیانی ملیۆنەها کەس لەسەر بنچینەی بەهاکانی ناتوندوتیژی راوەستاوە، دامەزراوە گەورەترەکانیش وەك ئاوێنەیەك دەبێ دەست بکەن بەتیشکدانەوەی ئەم بەهایانە، ئەو رێگەیە کە





ئەو لەسەری دەڕوات لە مۆدی بچووکی ناوماڵ، لە ناخی تاك، لەنێوان خزم و ناسیاو و هاوڕێیاندا دەست پێدەکات و هێواش هێواش فراوانی دەبەخشێ بە بازنەی خۆی بەرە و چین و توێژەکان و پاشان گشت کۆمەڵگا و پاشان لەوانەیە هەندێ جار گشت جیهان بگرێتەوە. چاکترین شایەتی ئەم مۆدە خوازراوە ژیانی خودی گاندییە، کە پەیامە بێدەنگ و وزەبەخشەکەی تەنانەت ئەمڕۆش پاش تێپەڕبوونی سێ دەیە دەگاتە بەر گوێمان و ئێمە بەرەو ئەوین بەخشینێکی هەرچی زیاتر و ئەنجامدانی خزمەتی هەرچی گەورەتر بانگ دەکات.

(کۆتایی)